
Meine Tochter Gott ist allmächtig
Seit lang Zeit höre ich von dir diesen Satz
.Ich weis .dass Du nicht religiös bist
..Ich habe nie gesehen
.dass Du in die Kirche gehst
.Gott ist nicht in der Kirche oder Moschee
Wo ist Gott ?
.In der Seele und Geist der Menschen
Wo ist der menschliche Geist
Gott Weis es
. Oh...Du redest wieder über Gott
. Es gibt zwei heilige Existenten in die Welt
Die erste ist Gott. Die zweite ist die Mutter
Warum ?
.Beide erschaffen Menschen
Deutschland 2012



Мой друг Джаз, я рада
видеть своё фото на
обложке твоего романа.

**فۆتۆی بەرگی یەکەم .. چنگیانی**

**فۆتۆی  بەرگی دووهەم... لانە**

**سەرنج :**

**تکایە لە هەڵەی زمانەوانی  ببوورن**

**هەموو دەزگاکانی چاپەمەنی ئازادن لەچاپکردنی ئەم رۆمانە بەمەرجی پاراستنی دیزانسی بەرگەکە وناوەرۆکی رۆمانەکە .**

**ئەم ڕۆمانە پێشکەش بە : پێنج  خۆشکە مەزنەکەم**

**دادە فاتمە**

**دادە عایشە**

**دادە حەپسە**

**دادە شمسە**

**دادە کافیە**

**نەك تەنیا خوشکن . بۆ من پێنج دایکن**

**سوپاس بۆ :**

- **کاتیای هاوڕێم ڕێگەی بەکارهێنانی وێنەکەی دام بۆ بەرگی ئەم ڕۆمانە .**

- **برای نووسەر کاك هونەر توفیق ئەم ڕستەیەی لێوە فێربووم ( سێکس مردنێکی ساتیە)**

- **هاوڕێ نووسەر یاسین بانیخێلانی زۆرکۆمەکی کۆمپیۆیتەری کردم .**

## پێشووتە

ئەرستۆتالیس دەڵی ئەدەب لاسیکردنەوەیە لەرێگەی زمانەوە منیش دەڵێم ووشە لاسایکردنەوەی کردارە لە رێگەی ووتن ونوسینەوە . زیندوبوونی گشت زمانەکانی جیهان لە گەشەکردن و دەوڵەمەندکردنی زمانەکەدایە . داهینان لە زماندا یەکیکە لە فاکتە گرنگەکانی زیندووبوونی زمان . دەکرێ نوسەرێك ببێ بە داهێنەری چەند ووشەیەك بۆ ئەو زمانەی پێدەنووسێ.

ووشەیەك کاتێك دەبێت بە ووشەیەکی ڕەسەنی زمان کە بتوانرێ مانایەکی پوختە و ئاستی بەکارهێنانی زۆر بێ .

بەکارهێنانی ووشەی زمانی میللەتێکی تر.لەکاتێکدا ڕەوایە کەزمان و بابەتی نوسینەکە لەوجورە ووشانەی تێدا نەبێ . کەنوسینی بابەتەکە پیویستی پیەتی . تەکنەلۆژیا ڕۆڵێکی گرنگ لە دەوڵەمەندی زماندا دەبینی . کەم زمان هەیە لە دونیادا کۆمەڵە ووشەی تێکەڵاویان نەبێ . لە زمانی ڕوسیدا زیاد لەسەد ووشەی کوردی ڕەسەن هەیە , ئیستا

بۆته بەشێك لەو زمانە زیندوە. جیاوازی زمانی میللەتێکی بێ دەوڵەت وکۆلونیالیکراوی وەك کورد.لەتەك میللەتێکی خاوەن دەوڵەت جیاوازە . چونکە پاراستنی شوناسنامەی سیاسی و میژووی میللەتی کۆلونیالیکراوە پابەندە بەرەسەنی زمانەوە .

خەوشە کورد ووشەی زمانی کۆلۆنیالیستەکانی کوردستان بەکاربهێنێ . لێ خەوش نیە کورد ووشەی زمانە زیندوەکانی تر بەکاربهێنێ . بۆ چونکە بەکارهێنانی ووشەی کۆلۆنیالیستەکان یانی پیادەکردنی پرۆژەی توانەوەی زمانی کوردی دریژەدان بە سرینەوەی ناسنامەی نەتەوەی کوردی بە هوی زمانی کۆلونیالیستەکانەوە .

ئەگەر ئەوان ووشەی کوردی بەکاربهێنن بۆ دەوڵەمندکردنی زمانی خۆیان وەك دزینی سامانی کوردستانە بۆ بەهیزکردی ئابوریان .

ئەم بابەتە زۆرگرنگە لەپیشەکی ئەم رۆمانەدا جێگەی تەسکە .

لەم رۆمانەدا چەند ووشەیەکی نۆیم بەکارهێناوە . کۆمەڵە ووشەیەك چ وەك مانا چ وەك (ئیستاتیکا)جوانوانی زمان و پێکهاتەی جەستەی رستە و جوانوانی رۆحی دەستەواژە و دەق.

هیچ ووشەیەك بێ بوونی کردار و بوونی بوونی نیە.

ووشەی دز لەکرداری دزینەوە هاتۆتەبوون .

ووشەی درۆزن لە درۆوە .

ووشەی چاك لەکرداری چاکەوە .

ووشە بنەمای رستە و دەستەواژەکانی نووسینە .

شۆخسادە

شۆخسادە : ئەو شۆخە خانمەیە کە کەشخە بەشۆخی خۆیەوە ناکات.

شۆخکیژ

شۆخکیژ: کە خۆێنەر ئەم ووشەیە دەخۆینیتەوە وێنەی کیژێکی شۆخی دێتە بەرچاو .

پاککار : کاریکی پاك

ڕێکپۆش : کەسێکە جوان خۆی دەپۆشێ .

پەریپۆش : پەری سمبۆڵی پاکی وناسکی وجوانیە تاییەتە بەئافرەت ئەو ووشەیە بەئافرەتێك دەوترێ کەوەك پەری خۆی پۆشیوە.

تابلۆیەك بەرەنگ وبازیکردنی فلچە و توانا و سەلیقەی هۆنەرمەندێك نەخشین دەبێ .

پارچە مۆسیقایەك لەکۆککردنەوەی چەپکە نۆتەیەکەوە ئاوازێکی لێدروست دەبێ .

بەشێ لەکاری نووسینیش هونەرە .

نووسەر هونەرمەندە لە بارکارهێنانی ووشە و ڕستە و دەستەواژە و وینەگرتنی ڕووداوکان لە هونەری نووسینی سیناریۆیدا.

ڕۆڵی سیناریۆ لە نووسینی (رۆمان . نوڤل . چیرۆکدا) لەزەهنی خۆینەردا بۆ بینینی ڕووداوەکانی نێو دەقەکە وەك ئاوێنە وایە .

زمانی ڕۆمان ووشەیە . ووشە چەند سادەبێ زووتر و ڕوونترخێراتر خوێنەر دەکات بەکارەکتەرێکی نێو ڕۆمانەکە.

ئەوە زمانی نووسینە پردی سایکۆلوجیی نێوان زەهنی خوینەر و ڤیگۆرەکانی دەقەکە دروستدەکات.

***بۆیە چاوی خوێنەر لە خوێندنەوەی درامایەکدا فرمێسك دەیگرێ.***

***لەهەمان دەق . هەمان خۆینەر لە دیمەنێکی کۆمیدیدا دەداتە قاقای پێکەنین.***

***هەموو ڕۆمانی پەیامێکی پێیە .***

***کەسایەتی ڕۆمان نەبە ووشەی ئاڵۆسکاو و نە بە درێژدادڕی و قەبارەی زۆری لاپەڕەکانە . بەڵکو بە پەیامی ڕۆمانەکەیە .***

***ئەگەرخوا دروستکەری مرۆڤەکان بێ و جیاوازی کارەکتەرەکانی پێبەخشیبیتن .***

***ڕۆماننووسیش خوای فیگۆرەکانی ڕۆمانە .***

***بە ووشە ڕۆح دەکات بەبەری کەسایەتێکاندا .***

***لە نووسینی رۆماندا گشت فیگۆرەکان خاوەنی یەك جەستە و توانا و قەبارە و تەمەن و ڕەنگ وکارەکتەرێك نین.***

***بۆیە کاری ڕۆمانووس بەنووسین وەك کاری خوا وایە لە دروستکردنی فیگور و ئەکتەرەکانی نێو ڕۆمانەکە .***

***لە هەموو کارێکی ئەدەبی و هونەریدا ڕەگەزی خەیاڵ و میژوو و فەنتازیا . ڕۆلی گرنگیان هەیە.***

***مەرج نیە(خەیاڵ . میژوو . فەنتازیا)ڕووبەرەکانیان لەدەقێکی ئەدەبیدا بەتایبەتی لە نووسینی ڕۆماندا یەکسان بن.***

***ئەدەب ئەگەر خەیاڵ سەرچاوەی ڕەسەنی بێت ئەوە لە نووسینی ڕۆماندا میژوو وخەیاڵ دەتوانری تێکەڵاوبکرێت .***

***چونکە ڕۆحی هەندی ڕۆمان میژووە.***

*(نۆڤلیتی دووپشك)ی گۆنترگراس باس لەکارەسات و گوزەرانی ئەلمانیە هەڵهاتووەکانی جەنگ وچارەنووسی تارکیان دەکات.*

*رۆمانی (وێرانەی) بهاالدین نوری گێرانەوەی کارەساتەکانی 1988.*

*(شەڕ و ئاشتی) و (ئەناکارانینا) ی تۆلۆستوی و رۆمانی (برایانی کارامازۆف وگێل)داستۆیۆفسکی.ڕومانی (دایك)ی مکسیم گۆرکی یش باس لەژیانی کۆمەلایەتی رووسەکانی پیش شۆرشی 1917 دەکات گشتی رۆمانی میژووین .*

*ئەو رۆمانانە بەشێکن لە میژووی نەتەوەی ئەڵمان وکورد و ڕوس لێ بەزمان و فۆرمێکی ئەدەبی .*

*جیاوازی لەنێوان میژوونووس و ڕۆماننووسدا.*

*میژوونوس ناتوانی پشت بەخەیاڵ ببەستێ . ڕۆماننووس ئازادە کەڵك لەخەیاڵ و میژوو وەربگرێت.*

*بەکەڵك وەرگرتن لەچێژی جوانوانی (ئیستاتیکا).*

*کانت دەڵی(دەسەلاتی جوانی لەچێژەوە هەڵدەقوڵێ )چێژی هونەری گرنگی بەکرۆکی بابەت نادا . چونکە چێژی هونەری چاوگەی فەنتازیا وخەیاڵە.*

*خەیاڵیش ئەدموسفیرێکە ڕوینەداوە تابیگێریتەوە.*

*بەڵکوخەیاڵ فەنتازیای رۆحی نووسەرە . نووسەر هەمیشە خاوەنی فیزەی تێپەربوونی کیشوەری خەیاڵە.*

*بۆیە ئەو ئەدوسفیریەی وێژە دەیخەملێنێ ئەدموسفیریکی خەیاڵیە.*

*جیاوازی نێوان خەیاڵ و لۆژێك :*

پڕۆژەی لۆژیك شانسی پێادەكردنی زۆرە . پرۆژەی خەیاڵ لەپڕاكتیكدا سنوری تەسكە و زۆر تۆخبوونەوە تێدا دەمانگەینیتە ئەدموسفێرێكی فەنتازیای . فەنتازیاش یانی دەرەوەی لۆژیك .

خەیاڵ بە كەڵكە چونكە هەموو پرۆژەیەك لە سەرەتاوە لە ڕەحمی خەیاڵەوە دەترازیتە هوشیاری مرۆڤەوە .

دواجار بەگەشەكردنی خەیاڵ و نزیكبوونەوەی لە لۆژیك دەبێتە نەخشە و لەكۆتایدا و لەپراكتیكدا دەبێتە پڕۆژەیەكی لۆژیك.

پێش ئەوەی مرۆڤ بگاتە سەرمانگ پڕۆژەكە پڕۆژیەكی خەیاڵی بوو .

دوا جار خەیاڵ بوو بە پڕۆسێسی گەیشتنی سەگێك بۆ مانگ.

یەكەم مرۆڤ( گاگارین) ئەو خەیاڵەی كردبە لۆژیك. ئیستا سەفەركردن بۆ مانگ بۆتە بابەتێكی لۆژیك و هەموو مرۆڤێك باوڕی پێدەكات.

بەم شێوەییە مرۆڤەكان جیاوازی لە نێوان زەمەنەكاندا دەخولقێنن .

چەمكی خەیاڵ هێندەی چەمكەكانی ژیان فراوانە . خوێندنەوەیەكی فەلسەفیانە هەڵدەگرێ . نەك تەنیا لەبواری دەقە ویژەیەكاندا .

لە سیاسەت وتەكنەلۆژیا و كۆمنیكاتیسوین و ئابوریشدا سەرەتای گشت پرۆژەیەك خەیاڵە.

ئەوە ئەنجامی پڕۆژەی خەیاڵە جیهان بۆتە گوندێكی بچوك.

لێرەدا درێژە بەم بابەتە نادەم .

هێندە دەڵیم خەیاڵ ڕۆحی وێژە ( ئەدەبە).

دێیەکی خنجیلانە دوور لە جەنجاڵی شار و کەپیتاڵ .

کۆمەڵە خێزانێکی هەژاری لەباوەشگرتبوو.

سروشتی جوانی ئەودێیە سروشت و ڕەوشتی مرۆڤەکانی وەك خۆی جوان و سادەکردبوو.

بە پیر و گەنجەوە بە نێر و مێی وە هێندە هۆگری یەك و یەکتریان خۆشدەویست لە ئەندامی خێزانێکی دڵسۆز بۆ یەکتر دەچوون.

عەشقی جوان بۆ ژیانی جوان بیرکردنەوەیان بوو .

نەوە دوای نەوە ئەوکولتورە جوانەیان لەنێوان خۆیاندا دەگۆێزایەوە .

چەندەها چیرۆکی خۆشەویستی حکایەتی عەشق میژووی ئەو دێیەی نووسیبوە.

بەهۆی پەیوەندیە بەتینەکەی نێوانیان و دووریان لەدونیای جەنجاڵی شارە گەورەکان کێژ و لاوەکانی ئەو دێیە بەکەمی لەتەك کەسێکی تردا عاشق دەبوون .

کە بومەلەرزەی گۆڕانی سیاسی هەناوی وولاتی ڕوسەکانی لەرزان. پیریوسترۆکیا و گورباتشوف لە ماوەیەکی کەمدا لە سەرزاری ملوینەها

***مرۆڤ لە روسیا و جیهاندا بوون بەدوو ووشە ڕۆژانە هەر کەسە بە شێوەیەك گەمەی هزری لەتەکدادەکرد.***

***نەوەی نۆی ڕووسەکان لە هەموو کەسەکانی تری جیهان زیاتر لە چاوەڕوانی ئەنجامێکی سەقامگیرکردنی سیاسەتی گۆرباتشۆفدابوون.***

***روسیا شلّەقا.***

***چەشنی شلّەقاندنی زیندانێکی فراوانی پڕلەزیندانی چاوڕوانی ئازادی .***

**هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە نەخشەیەکی بۆ ئەنجامی پیرۆستۆریکیا** ***و ژیانی نۆی و ئایندەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا کێشابوو بەدرێژای تەمەنی چەوسانەوەی کۆمۆنیستەکان مرۆڤەکان لەچاوەڕوانی هەناسەیکدابوون .***

***بۆیە سەرلێشوان و پەلەیەکی بیسنور رێچکەی بیرکردنەوەی کۆمەلّگای گۆڕی و پەیوەندیە کۆمەلاّیەتی وسیاسی و ئابوریەکان ئالّۆسکان و ڕەوشتی کۆمەلّگا لە گرێژنە چوو.***

***یەکەم قوربانی ئەم گۆڕانکاریە چینی کریکار و هەژاران و بەتایبەتی ئافرەتان بوون و سوپایەك لە گەنجانی بێکاری دێهات وشارەبچوکەکان بەنێازی ژیانێکی نۆی وەك روبارێکی تینوو بۆ ئامێز دەریایەکی پڕ شەپۆلی کەپیتالی پەرش وبلاّو ڕژانە شارە گەورە میترۆپۆلّەکانی سان پیترسبۆرگ و مۆسکووە.***

***ئەننا وێنەیەکی شۆخسادەی سروشتی جوانی دێکەیان بوو.***

***لەخێزانێکی خوێندەوار و لەئامێزی هوشیاری ودڵسۆزی دایکێکی ڕەسەنی ڕوسی ئابوریناس و باوکێکی خانەنشینی ئەفسەری سوپای سووربوو.***

***هوشیاری و تاقیکردنەوەی ژیانی باوك ودایکی کەرەسەیەکی بەپێزبوون بۆ هوشیاری وکەرەکتەری کەسایەتی ونەخشەی ئاینده و بیرکردنەوەی ئەننا لەژیاندا .***

***دایکی شەیدای ئەدەبی کلاسیکی روسی وئاشنای دێرپەدێری هونراوەکانی پۆشکین و مایکۆفسکی ڕستەی رۆمانەکانی تۆلیستۆو لیرمۆنتوف و دەیسکوفسکی و چیرۆکەکانی گۆگۆل وچیخۆف وشانونامەکانی سانستلافسکی ومامۆستایەکی زرنگی پەرتوکەکانی لینین وترۆتسکی فەلسەفەی ئابوری مارکسی بوو.***

***ئەننا لەقوتابخانە کۆمەڵی مامۆستا ولەماڵیشەوە دوو مامۆستای هەبوو.***

***دایکی لەسەردەمی منداڵیەوە کردبووی بەعاشقی کۆلتوری ڕۆمانیسیتی ڕەسەنی ڕوسی . بەجوانی رۆحی شیعر وباڵای ڕۆمان وباوەشی نۆڤل.ملۆانکەی نۆتەی سمەڤۆنیا ئاشنای کردبوو.***

***تەمەنێکی خونچە و ئەرشیفێ لە جوانی ژیان لە ژووره سادە و خانووە کۆنەکەیاندا هەبوو . بەدێژای تەمەنی پێکەوە بوونی دایك وباوکی رستەیەکی زبر یەخەی خانوەکەیانی نەگرتبوو.***

***ئەو دوو مرۆڤە هێندە لەیەکەوە نزیك بوون سروشتیان وەك دوو قاشی ئەستێرەیەك رووناکی یەکتریان هەڵدەمژی.***

چۆن دایکی بەئەدەبی کلاسیکی روسی وئابوری مارکسی بڤەی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئاشنایکردبوو , باوکیشی وەك ئەفسەرێکی خاوەن ئەزمون بەزیانی جەنگ وجوانی ئاشتی تینویکردبوو.
کە گۆپکە پەمەیەکانی سەرسنگی ئەننا هەڵتۆقین .
جوانییەکی شێتکەری بەسنگ ولەشی بەخشی .
لەو سەردەمە خونچەییەدا حەزی نێرینە لە رۆحیا چەکەرەی کرد و شەیدای ئەلکسەندەری هاورێ قوتابخانەی بوو.
هاوینە و سروشت بۆ پاداشتی زستانی سەخت وپڕکرپیوەی ڕوسیا تیشکی چاوی خۆری بەسەر دێیەکە و ناوچەوکەدا پەخشکردبوو .
ئەلکسەندەر و ئەننا بۆ پشودانی جەستەی ماندوی زستانی سەخت وهەڵمژینی بۆنی گیا و گوڵەکێویەکان پیاسەیان دەکرد .
وورده هەناسەی گەرمی رۆحیان بەپردی دەستی تێکەڵاویان.
گڕی حەزی جەستەی هەردوکێیانی لەئامێزی یەکتریدا گرێدەدابوو .
ئەلکسەندەر بەدەم ڕێگاوە چەپکە گوڵێکی کێویلەیی چنی و لەپشتەوە ئەننای لەباوەشکرد وچەپکە گوڵەکەی پێشکەشکرد.
ئەننایش قردیلەی ماچێکی سادەی لە لێوە زبرەکانی ئەلکسەندەر دا.
لەدەشتایەکەوە ترازانە نێو ئامێزی پەڵە چنارێکی قەد سەوزی بەهاری.
چنارەکان هێندە بەلەدایك بوونی گەڵا وەردیلەییەکان دڵشادبوون بە شنەبایەکی ئاستەم سەمایان دەکرد.
لەسەرپەڵە گیایەکی جەستە لۆکەیی پاڵکەوتن.

تەنیا چاوی بەتینی خۆر لە نێو پەڵە چنارەکانەوە سەرتاتکێی دزینی نهێنیەکانی نێوان ئەننا وئەلکسەندەری دەکرد .

ئەلکسەندەر سەری لەسەر سنگی ئەننا دانابوو .

بۆنی جەستەی هەڵدمژی. نەك ناوگەڵی هەموو ئەندامانی جەستەی گڵپەی حەزی لێهەڵدەسا.

ئەنناش پەنجەکانی بەقژە پڕەکەی ئەلکسەندەردا دەگێڕا

شنەبای سەمای چنارەکان . بۆنی نێرینەی بەرۆحی دەگەیان.

پێش ئەوەی نێوگەڵی ئەننا کڵپەی حەز بیگرێ , گۆپکەکانی کەوتنە گرۆگاڵی مژین .

ئەمە یەکەمجار نیە ئەننا ماچدەکات . لێ یەکەمجارە چاوی خۆر لە درزی باڵای بڵندی چنارەکانەوە سەرتاتکێی دزینی نێهنی ماچەکانە.

ماچەکان هێندە گەرمبوون رۆحیان باڵیان لێپەیدابوو بەرەو قوڵای ئاسمان فڕین و بەجەستەی ڕووتەوە .

لەسەر پێخەفی پەڵەگیایەکی سەوز یەکتریان دەلستەوە.

ئەننا بە پشتا پاڵکەوتبوو تەنورەکەی کەمێك هڵکشابوو .

نەرمایی نێوان ڕانەکانی لە جیاتی ئاودەربدەن نمە شەونمی هەنگوینی روحێان دەردا.

جێ پەنجەکانی ئەلکسەندەری خۆشختوکەکردبوو .

تاپەنجەکانی ئەلکسەندەر بەرە و قوڵای ناوگەڵی بچونایە دڵۆپە هەنگوینەکانی نێوگەڵی فرتر و شیلاویتردەبوون.

پەنجەکان ترازانە قولأیی نێوچاڵی گومەزێکی توکاوی پڕهەنگونی گەرمەوە .

زمانی ووشکی پەنجەکانی ئەلکسەندەر هێندە تینوبوون نەك تەنیا هەنگوینی ناوگەڵیان خواردەوە وەك گلاراویان گرتبێ ختوکەی دەمی گومەزە توکاویەکەیان دەدا. بەدوای نمە هەنگوینی زیاتردا دەگەڕان .

ختوکەی پەنجەکانی ئەلکسەندەر جەستەی ئەننای لە جوڵەخست.

لاقی والأ و سنگی ترازاو جەستەیەکی پەشمەکەی چاوەڕی یەکەم تەکان بوو.

لەسەرەتای بازییە ماچەکاندا چەند دووگمەیەك لەکراسەکەی ترازبوو درزی نێوان مەمکەکانی چاوی ئەلکسەندەر و خۆری شیتکردبوو.

گۆپکەکانی وەك دووماسی تازە لەدایك بوو لە چاوەڕی مژینی تیشکی خۆر و تەڕایی نێودەمی ئەلکسەندەربوون.

فیی رۆحی ئەلکسەندەر گشت دووگمەکانی ترازان ومەمەکەکانی ئازادبوون گۆپکە پەمەیەکانی بەماچی تیشکی خۆر و مژینی لێوە زبرەکانی ئەلکسەندەر ڕەنگیان گۆڕا.

خۆر میکیاجی جوانێکەی جوانتر کرد.

چاوەکانی ئاوینەیەکی شین بوون حەزی رۆحی لێدەتکا.

دڵۆپی شینی نیگای شەرمی سەرتای یەکەم ژەمی سیکسی .

لەرۆحی ئاوینەی چاوەکانیەوە تکانە سەر زەوی رۆحی کڵپەداری ئەلکسەندەر.

ئەننا بەرۆحێکی پڕشەرمەوە حەزی لە یەکەم ژەمی سیکس بوو.

ڕۆحی ئەلکسەندەر هونەرمەندێکی شێوکاربوو ڕەنگەکانی جەستەی لەسەر ڕووبەری سنگی پەڵە گیا سەوزەکە وەك تابلۆیەکی هونەری دەستی خوا ئەننای بە ڕووتی دەبینی .

ماچی گۆپکەکان هێندەگەرم بوون ئەلکسەندەر فیی سێکسی لێهات دەرپیێ قوڵانجیەکەی ترازان .

گڕی پەنجەکانی بیخی مووەکانی بەرموسەڵانی ئەننای سووتان.

هەر پینج پەنجەکان بوون بەچەپك وگومەزە تووکاویەکەیان قوتدا پەنجەکان تێرلینجاوی گومەزەتووکاویەکەیان هەڵمژی تیونتیان شکا.

ڕۆحی ئەلکسەندەر هەرتینوو بوو.

ئەننا پەیکەرێکی گۆشتنی ژێر پراچکتوری چاوی خوا.

ئەلکسەندەر درندەیەکی عاشق لە عەزرەتدا دەویست بیخوا.

لیۆەکانی تیژمژیبوون مووە زبرەکانی سمیڵی ئەلکسەندەر لێوەکانی تیرکردبوون .

ئەننا وەك گەرەکی بێت پشوویەك بەلێوەکانی بدا گەردنی بەشماچ بکات گەردنی بەرزکردەوە پێڵووی چاوەکانی داخست .

دەویست باخچەی حەزی بەهەشت ببینێ . حەزێکی بیسنوری ئەننا.

جەستەی ئەلکسەندەری لەباوەشگرت توند نوساندی بەخۆیەوە و دەیویست ئاڵۆشی گڕاوی ناوگەڵی دابمرکێنیەتەوە.

چاوەڕی تاقیکردنەوەی یەکەمژەمی سیکسی بوو.

کەسێك پێش ئەلکسەندەر نەشیلەی خونجەی گۆپکەکانی مژیبوو نە پەیکەری گوشتنی بەڕووتی بینی بوو.

جەستەیان هەڵاوی حەزی لێهەڵدەسا .

چاوی گەڵا هەرزەکارەکانی سەرچنارەکان .

لەبینینی نمایشی سیکسی ئەوان .

نە ئەتروکان

شەرمی سەرتایی یەکەم قوناغی نۆی چرکەساتی پەیوەندەیە رۆحیەکانیان دەژمارد.

بەچرپەی هەناسە برکێێ شەرماوی . چاوەڕی تەکانێکی ئەلکسەندەری دەکرد تا بەرۆح دیاری سروشت وخوا وەربگرێ .

بۆیە کلیلی گشت ئەندامانی جەستەی دابووە دەست حەزەکانی ئەلکسەندەر و لاقەکانی شلل وبڵاوکردبووە .

ڕۆحی ئاسمان وسروشت جەستەی ڕۆحی ئەلکسەندەری دەجوڵاند . کەترازانیە نێوگەڵیەوە . ئەننا زریکەیەکی ناسکی کپاوی ڕۆحی چەپکە نۆتەیك بوون گەڵا ساواکانی چنارە باڵابڵندەکانی خستە سەما.

چێژی تەکانەکان هێندەگراوی بوون هەردووکیانی بەدەست ولاقەکانیان پێکەوە گرێدا.

دوای چەند تەکانێکی ئاڵۆشاوی هەرزەکاری .

چەند دڵۆپێ خوێنی گەش تێکەڵاوی هەنگوینی گەرمی ناوگەڵی بوون تك تك ترازانە خۆاری و دەمی تینوی چڵەگیا سەوزە تاساوەکانی ژێر سمتی ئەننایان سوورکرد . تینۆتیان بە ئاو و خوین...شکا.

تەمن17ساڵە و جەستەی مەلۆیەك کڵپەی حەزە .

لەسەر پێخەڤی هەورێکی سەوزە .

لەژێر خێوەتی ڕووناکی خۆر و سەمای گەڵای چنارە باڵابڵنەکان لینجاوی نێوگەڵیان جەستەی هەردووکێانی بەعەشقی پێکەوەبوونەوە گریدا.

چونکە شەیدای یەك بوون . ژەمەکانیان ئەوەندە زۆربوو تا دواتنۆکی تەڕای جەستەی ئەلکسەندەر نەتکایە نێوگەڵی ئەنناوە .

ئەننا ئۆقرەی تینووتی سیکس نەشکا .

ئەم ئاشنا جەستە و ڕۆحیە رۆحی هەردووکیانی لەیەك مارەبڕی.

زەماوەندیان لەو ساتەدا دەبێت کە ژیان دەڵێت ئاسایم .

ئەننا گەڕایەوە ماڵەوە نەك لێوەکانی هەموو باڵای رەنگ ودەنگی زەردەخەنە بوون .

سلاوێکی لەدایك وباوکی کرد .

سێبەری شەرمێك لەدەوری جەستەی دەخولایەوە .

بازنە ڕووناکێەك وەك ڕووناکێکەی دەوری سەری مریەمی پاکێزە. کەژاوەیەکی بەختیاری بوو . لەدەوری سەری ئالابوو .

تەنیا دایکی ڕوناکیەکەی دەبینی

هەستیکرد ئەو سەرپۆشە شەرمە تەنکە و ئەو ڕووناکیەی دەوری سەری ئەننا برینی قۆناغێکی نۆی ژیانە.

ئەننا لەبەر ئاوینەکەیدا لەتەك خۆیدا لە گفتوگۆیەکی بێدەنگی زەردەخەنە ئامێزدابوو. بیری لەچێژی تەکانەکان دەکردەوە .

کە وێنەی دایکی لە ئاوینەکەوە بینی .

ئاوڕێکی دایەوە ویستی بڵی دایە ....

دایكی پرسیارەكەی سەری زمانی گرێدا ووتی :

- هەتاوی دوای زستانی سەختی روسیا ڕۆحێكی بزیوو بەسروشت ومرۆڤ دەبەخشێ .

- ڕۆژەكەت چۆن ڕۆژێك بوو؟

- دایە گیان ڕۆژێكی مێژووی

- كچم ئەلكسەندەر گەنجێكی زۆرباشە . هەردووكتان تەمنتان لەسەرەتادایە . یەكتری بەختیاربكەن . بەڵام بۆدروستكردنی منداڵ هێشتا زووە . كۆنترۆڵی حەزتان بكەن . چونكە ئەركی دایك تەنیا شیرپەخشین نیە بەڵكو ڕۆح بەخشین وكات بەخشین وخۆشەویستی وئەركی زۆر زۆرە .

جەرگەكەم تۆ لە قۆناغێكی زۆرجوانی تەمەندایت .

ئەم قۆناغە بە هوشیاری وجوانیەوە ببڕە دڵنیابە ئاییندە باوەشی زەردەخەنە و بەختیاری بۆ تۆ و ئەلكسەندەر و منداڵەكانتان دەكاتەوە .

لەخۆشیدا لێوی خۆارەوی گەست وباوەشی بە دایكیاكرد.

تەڕایەكی تەنكی خۆشەویستی گلێنەی چاوە شینەكانی تەنی .

- دایەگیان ئەم هەموو هوشیاریەت لە كۆیەوە هانیوە ؟

- چۆن زانیت من و ئەلكسەندەر ئیمڕۆ سێسكمان كردووە؟

- كچم منیش لەسەرەتادا وەك تۆ گەنج بووم . بەپیری لەدایك نەبووم . من مامۆستای سەدەها كیژی لاو و گەنجی وەك ئەلكسەندەر

بووم . جگە لەمەش من دایکتم و تۆ جەرگی منی . تەنیا چاوەکانم تۆ نابینن . رۆحم پێش چاوم دەکەوێت لە بینینی تۆدا .

- لەیادتە ئەو ساتانەی لەناکاو تایەکی گەرم جەستەتی دەهاژان من لە پرخەی خەو و ئامێزی باوکت ڕادەچڵەکیم دەهاتم بۆ ژوورەکەت ؟ دەزانی بۆ ؟

- نا

- منیش نازانم

- ئەی کێ دەزانی ؟

- تەنیا خوا .

- خوا ؟

- بەڵی خوا

- چۆن خوا دەزانی ؟

- منیش نازانم چۆن خوا دەزانی

- کە تۆ نازانی بۆ ئاماژە بەخوا دەکەیت ؟

- کچم واز لە پرسیاری خوا بینە .

- منیش بەگەنجیتی عاشق بووم . با تەمەنیشم هەبێ لەمانای عەشق تێدەگەم . تۆجگەری منی.

تەنیا من لەبۆنی هەناسەت ونێهینە بێدەنگەکانی گلێنەت دەگەم .

- ئیمڕۆ ڕەنگی چاوەکانت گۆڕاون.

برژانگەکانت بەرێز لە دەوری حەزی چاوەکانت دەستیانگرتوە بەموسیقای رۆحت سەمادەکەن.

- ئەوە نیە لێوەکانت بێ سووراو  سووراوی مژینیان لێدەتکێ؟

- ئەم سووربوونەی لێوت ئاکامی ماچەکانی ئەلکسەندەرە .

ئا وایە دەزانم یەکەمجارنیە ماچت دەکات . جیاوازی ماچەکان لەوەدایە ماچی تەك سێکس ماچی گراویە.

- ئەگەر لێوەکانیشت قرچە بیانگری هەر تینوی ماچن.

سێکس مردنێکی کاتیە . مرۆڤ لە دونیای جەنجاڵ دەترازینێ.

سەیرکی خێرای ئاوینەکەی کرد ووتی :

- دایکە ڕەنگی چاوەکانم هەر وەك خۆیانن . برژانگەکانم نەك سەما جووڵە ناکەن .
- دەکرێ لەئاوینەدا نەیان بینی لێ لە رۆحی رۆمانسیتی عەشقی ئەدەبیدا سروشتیان گۆڕاوە . ئەگەر پەرتووکە ئەدەبێکانی ئەم دونیایە لەعەشق ڕووتکەبتەوە چەند پەرتوکێك بۆخویندنەوە دەمینێتەوە.
- ئەوە پیوستی سروشت و مرۆڤە بەعەشق . هونراوە و ڕۆمان ومۆسیقا و  هونەر وئەدەبی دروستکردوە .
- ژیان بێ عاشقبوون هیچ مانایەکی نیە. عەشق جوانترین دیاری خوا و سروشتە . ئەوە زانایی خوایە بەعشقەوە جوانی ژیان نیشانی مرۆڤەکان دەدات .
- ئەو مرۆڤەی عاشق نەبێت نەخۆشە.
- ئەوساتانەی لەباوکت دوربووم بەنوسین رۆحم سەبوری دەهات . باوکت لەکۆلیجی سەربازی ومن لەئابوری ماوەی بینمان تەسك

بوو . نامەیەکم بۆباوکت نەنووسیوە بێ چەپکە ووشەیەکی شیعری .

وەك تاسەی کاتەکانی گەنجیتی بکات.

هەناسەیەکی هەڵکیشاو ووتی

- شەوێك لەشۆینـژینی قوتابیانی زانکۆ زۆر بیری ماچەکانی باوکتم دەکرد و رۆحم بۆ بۆنی هەناسەی زیرەی کردبوو .

- ئەمەم نووسی :

کەتۆ لێرە نەبووی من تەنیا بووم

کەتۆ هاتی هەر تەنیا بووم

جیاوازی بوون و نەبوونت تەنیا ماچ بوو

بۆیە کە تۆ هاتی و ماچمان نەکرد

هەر وەك بێ تۆ هەر تەنیا بووم

- ئۆی دایە گیان کەجوانە ئەم هۆنراوەیە هی پۆشکینە؟

- نا کچم هونراوەی پۆشکین نیە

- هی چ شاعیرێکە

- هی هیچ شاعیرێك نیە هی خۆمە

- تۆ شاعیریشی ونەمزانیوە ؟

- نا کچم من شاعیر نیم من سۆفی و عاشقی حەزەکان و جوانی وپیرۆزی خوا و سروشتم .

- دیسانەوە خوا ...ئەی سۆفی چیە ؟

- سۆفی ئەو کەسەیە کە عاشقی جوانیەکانی سروشت و خوا دەبێت.

- ***دایە خوا جوانە ؟***
- ***ئا خوا جوانە ... خوا پیرۆز***
- ***بۆ .***
- ***چۆنکە بێ بوونی خوانەبوون نە سروشت بوونی هەیە . نەجوانی .***
- ***ئەی ناشیرینەکانی سروشت ؟***
- ***ئەو پرسیارە بۆ تەمەنت هەڵگرە***
- ***بۆ ؟***
- ***چونکە وەڵامی ئەو پرسیارە هوشیاریت دەیداتەوە نەك من .***
- ***بۆ***
- ***وەڵامی منی بەتەمەن وەڵامی تۆی گەنج نیە .***
- ***دایە تۆ هوشیاری ؟چۆن ناتوانی وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە . خوا لەکوێ وخوا چیە ؟***
- ***من و باوکت وەڵامان بۆ بوونی خوا هەیە .***
- ***بۆیە هەردووکمان کەنیسەمان لەکۆڵ خۆمان کردۆتەوە , تۆ ئازادیت چۆن بیر دەکەیتەوە . من ڕێگە بەخۆم نادەم جڵەوی بیرکردنەوەی تۆ بە بیر و کلتوری زەمەنی خۆم جڵەو بکەم . چونکە هەموو نەوەیەك خاوەنی کولتورێکی خۆیەتی .***
- ***پیویستە مرۆڤەکانی نەوەی نۆی خۆیان بڕیا لەسەر پرسیارەکانی زەمەنی خۆیان بدەن . ئەمە جوانترین فەلسەفەی زەردەشتە کە ئازادی بۆ مرۆڤەکان مسۆگەردەکات .***

- زەردەشت ؟
- ئەمەیان کێیە ؟
- ئا زەردەشت . ئەو پیغمبەرە مەزنەی دونیای وونی فەلسەفەیە.
- باوکی گشت دینەکانی ئەم سەردەمەیە .
- دەڵێت پیویستە دایك وباوك ئازادی بەمنداڵەکانیان بدەن تا تەمەنیان دەگاتە 18 ساڵ . دوای 18ساڵی منداڵەکان خۆیان دینەکان هەڵبژێرن نەك دایك وباوکیان.
- ئەم تیڕوانینەی زەردەشت رۆحی دیموکراسی ژیانە . تاوانترین تاوانی دایك وباوك ئەوەیە منداڵەکانیان بەکولتوری خۆیان پەروەردە بکەن و بە دینی خۆیان بیرکردنەوەیان یەخسیر بکەن.
- تۆ دەزانی ئێمە تائیستا سەر بە هیچ کەنیسەیەك نین؟
- ئەی سەر بەچین ؟
- بە جوانی سروشت بە پیرۆزی خوا . بەڕۆمانسیت بە رۆحی شیعر .
- جوانی سروشت . هەمووشتێکی سروشت جوان نیە.
- ئەی ناشیرینەکانی ؟
- ناشیرن تەنیا وێنە نیە ؟
- ئەی چیە ؟
- جوانی رۆح جوانی بەگشت بوونەکان دەبەخشێ . ئەوە جوانی رۆحە ڕەنگە ناشیرینەکان ڕەنگاڵەی دەکات .

- ئەوە زەهری مارە مرۆڤەکان لە هەندی نەخۆشی رزگار دەکات. ناشیرینەکانیش گەر هوشیارانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت جوانن . ئاگر مرۆڤ دەسوتینی و هەر ئاگرە مرۆڤ لەسەرما دەپارێزێ.

- تۆ دەڵێت من شاعیر نیم چۆن ئەو هەستە جوانەت وەك ملونەك هۆنیوەتەوە ؟

- هەموو جوانیەك شیعرە . تۆش پارچە شیعرێکی خوایت. شیعر هێندە بڵندە من ناتوانم دەستم بگاتە بەپەنجەتووتەی شیعرێك . شیعر هاواری روحی بێدەنگییە . بۆیە شیعر دەتوانی دەست لەملی ئاوازیك بگرێت مرۆڤ بگرێنێ و مرۆڤ هەڵپەرینێ. چونکە شیعر زۆر لە رۆحەوە نزیکە.

- شیعر کاتێك ڕەسەنە کە نوسەرەکەی لەرۆحدا شاعیر بێ نەك تەنیا لەسەر پارچە کاغەزێك .

خوا تۆی جوان نەخشاندوە . کەواتە خوا جوانی خۆش دەوێت بۆیە مرۆڤەکان جوان دەنەخشینی . ئەوە تاوانە تۆ یان هەرکەسێکی تر نکۆلی لە کاری جوانی خوا بکات وجوانی خۆی بە ویستی ناشیرنی مرۆڤ بشێوینێ .

- ئەو پەچە و سەرپۆشەی موسوڵمانەکان دەیدەن بە ڕووی جوانی ئافرەتدا ئەوە دەستکاری کاری جوانی خوا و سوکایەتیکردنە بە سیستەمی لۆژیکی ژیان .

ئەوانەی وابیر دەکەنەوە نە رێزیان بۆ پیرۆزی خوا هەیە نە بۆ سروشت نە بۆ ئازادی مرۆڤەکان .

- بۆ ؟

- خوا وسروشت لە گشت مرۆڤ و دینەکانی جیهان کۆنترن .

- وایە

- کەواتە جوانی سروشت کەجوانی مرۆڤ بەشێکە لە سروشت دەستکردی خوایە . مرۆڤ هەیە ووشەیەکی نەنووسیوە کەچی زۆر شاعیرانە لەژیان گەیشتوە . پۆشکین و مایکوفسکی بۆیە مەزنن چونکە لەژیاندا شاعیر و لە نووسینیشدا شاعیربوون . هەموو نووسینێکی ئەدەبی گەر نووسەرەکەی لەتەك دەقەکەدا تەبای نەبێ ئەو شاعیرە ئەو نووسەرە ڕەسەن نیە.دەبێ شاعیر لەژیانی ڕۆژانەشدا شاعیرانە بیربکاتەوە ومامەڵە لە تەك جوانی ئەدەبدا بکات.وەك تۆ پیویستە شاعیرانە مامەڵە لەتەك جوانی خۆت و سروشت وژیاندا بکەیت .ئەگەر وابێت ئەوە تۆ نزیکترین کەسی لەخواوە چونکە سەرپیچی کاری خوات نەکردوە .

ڕووی خۆت بەڕووپۆشێکی ڕەش نەشاردۆتەوە . پرچی جوانی ڕەنگ خورمایت لەژێ سەرپۆشدا نەچەوساندۆتەوە .

- خوا لەم ژوورەدا ئیستا لەتەك ئێمەدایە .

ئەننا ئاورێکی کەمێك ترساوی بەژوورەکەدا دایەوە .

- دایە کۆا خوا ؟

- کچم کەس ناتوانی خوا ببینێ . خۆا دەتوانی هەمووشتێ ببینێ

چەن جوانە ئەم شیعرەی خەیام

گەر عاشق و مەست بچنە جەهەنەم

بەهەشت چۆڵ وهۆڵ وەك بەری دەستە .

- كچەكەم دەزانی خواش شاعیرە ؟ خواش عاشقە.چونكەجوانی سروشت ومرۆڤی دروستكردوە.

ئەدەب بۆجوانی ژیانی مرۆڤ دەنوسرێت . ئەوە بەری هونەری سروشتە تۆی جوان نەخشاندوە . جوانی ئافرەت شیعر دێنێتە گۆ . خوا تۆی بەم جوان وناسكیەوە دروستكردوە تۆ پارچەیەك شیعری دەستی خوایت . تۆی شیعر شەیدای ریشە زبرەكانی ئەلكسەندەریت . ئەلكسەندەر بەرِیشی زبرەوە بۆتۆی ناسكە پیست جوانە.

- سەیری لێوەكانت بكە چۆن لێوی زبری ئەلكسەندەر سوراوی لێوەكانتی سوورتر و رۆمانسی كردوە. ئەمە حیكمەتی خوایە لێوی زبر لێوی ناسك جوانتربكات. تۆش بۆ ئەو بەو ناسكیەوە جوانیت.ئەمە فەلسەفەی جوانی خوایە زبر ناسكی دەوێت , ناسك زبر .دەنگی ناسكی تۆ پیاو دیوانەدەكات . تینۆیتی چاوەرِوانی دەشكێنێ :

دەنگی تۆ لەدەنگی ئاوا دەچێ

لەبیابانیشدابێ

گۆیم لەدەنگت بێ..

تینۆیتیم دەشكێ

- پیاو شەیدای دەنگی ناسکی ئافرەتە. یاسای سروشتەوایە . ئەگەر لەزمانی ئاوینەکەت تێبگەیت لە هەموو ژوانێکی تۆ و ئاوێنەکەتدا ئاوێنەکەت ئەوراستیە دەڵێت :

( ئەننا تۆ بۆ ئەوەندە جوانی؟)

- تۆ گوێت لێنیە چونکە ڕۆژانە چەند جار جوانی خۆت دەبینی.

من بڕوام وایە کورپە لە یەکەم مانگەوە لەتەك جەستە و ڕوح و سایکۆلوجیتی دایکدا گەشەدەکات ئەو جوانیەی تۆبەری ئەو ژیانە جوان و پڕ ڕێزەی نێوان من وباوکتە . کە ڕۆح ئارام بوو جەستە ماندووبونی چاوەڕوانی دەشکێنێ . تۆ سروشت ڕۆحێکی شەیدای پێبەخشیویت . شتێکی سروشتیە تینوتی گەروی ڕۆحی نەرمت بە جەستەی زبری ئەلکسەندەر بشکێ ؟

نێر بە ڕەنگی نێرینەوە جوانە و ئافرەتیش بەڕەنگی مێنەوە . بەم دوو ڕەنگە جودایە تابلوی پێکەوبوونی ژیانێکی ئارام دەنەخشین . لەو ساتەوەی لەتەك باوکتدا ڕۆحمان مارەی سروشتیان بڕی .پشتمان لەیاسای کەنیسە و دەوڵەت کرد و بەیاسای سروشت و خوا وجوانی زەماوندمانکرد .

شەوێك نیە بێ بۆنی ئامێزی باوکت خەوم لێبکەوێ . تۆ دەزانی تائیستا من وباوکت بەپێ یاسای دەوڵەت وکەنیسە ژن ومیرد نین؟ تۆ دەزانیت من و باوکت زۆر لەو هاوسەرانە بەختیار تر و ڕازگۆترین کەیاسای کەنیسە و دەوڵەت زۆری لێکردون پێکەوە بژین ؟

ئەوەی ژیانی من و باوکتی بەیەکەوە گرێداوە یاسای سروشتە نەك کەنیسە ودەوڵەت؟سەیری پرچی سپی و چرچی نێوچەوان و شلی پیستم مەکە ئیستاش باوکت بۆمن وەك ئەو کورە هەرزەکارە جوان و قۆزەیە کە بۆیەکەمجار ماچیکردم.

لە ئامێزی پێخەفێکی ڕووتدا بەحەزێکی شەیدایی .

ئەو دیوو سروشتی ژیانمی پێئاشناکردم.

دەزانی من یەکەم هەنگاوم بۆ ناسینی باوکت نا؟

خۆشم نەمدەزانی ئەو هێزە لە کۆیوە هات یەخەی رۆحی منی گرت ولەنێو ئەو هەموو کوڕە گەنجەدا تەنیا باوکتم هەلبژارد؟

- لەپێشەکی ڕۆمانێکدا ئەم دوو ڕستەیەم خۆێندەوە هێندەی هەموو دەقی ڕۆمانەکە لام جوانتربوو . دەنووسێت :
- چۆن زەوی نازانی کەی بارانی بەسەردا دەبارێ .مرۆڤیش نازانی کەی عاشق دەبێ .
- ووتەیەکی زۆر جوانە دایکە...
- شانسی ئێمە لەوەدابوو هەردووکمان چاوەڕێ رێکەوتێك بووین .
- دایکە وێنەکانت گشتیان ماون.تۆبەگەنجیتی خانمێکی گەلێك جوان بوویت .دەپێم بلێ لەژیانتا چەند جار عاشق بوویت .

نەرمە زەدەخەنەیەك گرتی و ووتی :

- کچم هەموو قۆناغێکی تەمەن جوانیەکی خۆی و عەشقێکی خۆی هەیە. تۆ ئیستا عاشقی ئەلکسەندەری . تەمنت خونچەیەکی 17 ساڵە .گەر رۆحی ڕۆمانسیتی سروشت لە ئامیزیتدا بلاوێنی .ئەوە

لەهەموو قۆناغێکدا تۆ عاشقی . تۆ ئیمڕۆ بەدیداری ئەو حەزە گەیشتی کەپیویست بوو بگەیت . ئەمە حەزی ئەم تەمەن وقۆناغەتە .ڕۆژێك دێ تۆ شەیدای حەزێکی تربی . ئیستا نەمن دەزانم چیە نە تۆ .

- ئەی کێ دەزانی ؟
- ژیانت .
- پرسیارت کرد چەند جار من عاشق بووم ؟
- ژیان بێ عەشق مردنێکی بێ ڕەنگە ...مردن بە عەشقەوە ژیانێ پڕ ڕەنگە.
- دایە لەمە تێناگەم (مردن بەعەشقەوە ژیانێکی پڕ ڕەنگە)کە مرۆڤ مرد ژیانی چی ؟ ڕەنگی چی ؟
- مەبەستم ئەوەیە ئەو مرۆڤانەی کارە باشەکانیان هەڵویستە جوانەکانیان . چیرۆکەکانی عەشقیان بەزیندوی دوای مردنیان دەمێنێتەوە . ئەوان بەجەستە مردون لێ لە رۆحی میژووودا بەمردووی زۆر لەزیندوە بێکەڵەکان زیندوترن.
- تا مرۆڤ بمینی شارلی شاپلن . پۆشکین .غاندی بەزیندوی دەمێننەوە.
- شارلی شاپلن عاشق نەبوو .
- ئەو عاشقی جوانی ژیان بوو نەك تەنیا کەسێك.بۆیە خۆشەویستە چونکە ویستی بوو مرۆڤەکان لەجیاتی گریان پێبکەنن.
- ئەگەر تۆ ژیانت خۆشبووی . پیویستە عاشق بیت .

- پرسیارتکرد  چەند جار عاشق بووم .یەکجار ئەویش باوکت بوو. من وباوکت وەسیتمان کردوە .ئەگەر بەیەکەوە نەمرین لەیەك گۆڕاد بمان نێژن. ئەمشیان بۆ ویژدانی تۆی بەجێدەهێڵین . ئایا وەستیەکەمان جێبەجێدەکەیت؟

سۆز چاوەکانی کاڵکردەوە

- توو خوا دایە ناوی مردنتان مەهێنە .
- کچم دژی شتێك مەبە کەپیویستە بێ.
- دژی شتێك بە کە پیویست نەبێ وببێ .
- لەم فەلسەفەیە تێنگەم
- مردن پیویستە ببێ چونکە یاسای سروشتە . چەوسانەوەی مرۆڤ نابێ ببێ . ئەگەربوو دژی بە.
- مردنیش بەشێکە لەژیان . کەس نازانی دوای مردن ئەوژیانە چۆنە؟ بۆ من وباوکت ئەوە ژیانی دوای مردنە پێکەوە لە گۆڕێکدا بین .

- بیرم نایەت شەوێك بێ ئامێز باوکت خەوێکی ئارامم کردبێ . هەناسەمان لایلایەی چرکەکانمانە . مەگەر ئەو ساتانەی تۆ بەمنداڵی وڕکتدەگرت و دەگریای بۆ باوەشی من.

باوکت لە من دوور دەختستەوە. لەشیریش براپویتەوە کەچی تامەزروی مژینی گۆپکەکانی مەمکی من بویت .

- دایە گیان ببورە ئەو تاوانەشم بەرامبەر کردون؟

- نا كچم تاوانت نەكردوە . تۆش وەك كۆرپە بۆنی سەرسنگ و هەناسەی منت پیویست بووە.

- بەدرێژای تەمەنی منداڵیت بۆنی سنگی منت لەتەك شیردا هەڵمژیوە . بۆیە كەدەهاتیتە باوەشم پاش كەمێك خەوێكی ئارامت دەكرد . ئەمە گشتی جوانەوە دیاری ئەو سروشتەیە كە دینەكان پێدەڵێن خوا.

- بەهیوای ئەوەی ئەم ڕۆژەتان ببێ بەسەرتای پێكەوە بونێكی هەمیشەیتان وەك من وباوكت.

ماچێكی ناوچەوانی كرت ودەستێكی بە پرچەخاوەكەیدا هانی و ئەنناى لەژوورەكەدا بەتەنیا بەجێهێشت.

شەپۆلی پیرسترۆکیا وگۆڕانی سیاسی هێندە بەتەوژم بوو .
کۆشکی هیواوخەوی ئەلکسەندەر وئەننا ومیلوینەها  مرۆڤی لە ڕوسیا
ڕمان.
لە دێیێکەیاندا تەنیا باڕێك هەبوو .
ئەم باڕە ببووە بەشوێنژوانی گەنجانی دێیەکە.
کۆمەڵی کورسی ومێزی کۆن وتەلەفزوینێکی ڕەش وسپی. پەنجەرەکانی
تەپوتۆز و تەڵخاوی .
 پەردە چڵکنەکۆنەکانی لە چەند لایەکەوە لەبەرکۆنی درا و
شیببوونەوە . بە دووکەڵی جگەرە زەرد هەڵگەڕابوون.
 دیوارەکانی کەڕووی شێکاری هەڵهانیبوو.
زوربەی گەنجانی دێکەی ڕۆژانە لەباڕەکەدا بەدیار تەلەفزوینە ڕەش
وسپێیەکەوە لەچاوەڕوانی گۆڕانکاریەکاندابوون.
پرسیاری ڕووسەکان دوای ڕمانی کۆمۆنیست ئەڵتەرناتیف چ سیستەم و
ڕژێمێکی سیاسی دەبێت ؟
بە هۆی ناڕوونی ئەم دۆزەوە مرۆڤەکان لە هەڵپەی مسۆگەرکردن و
دەوڵەمندبوونی خۆیان بوون.
ئەگەر کەسانیکیش لەبەر نەبوونی توانای خۆاردنەوەی بیرەیەك
وچەند پێك فۆدگایان نەبوایە لەدوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی ڕمانی

سیستەمی کۆمونیستی وبوونی تەلەفزوێنێکی کۆن خەوی دونیای کەپیتالیستی گشتیانی لەوبارە کۆکردبووە .

کاتێك سیاسیەیەك لە تەلەفزوینەکەوە ڕاڤەی بکردایە.تەواوی دانیشتوانی بارەکە وەك لەژوری قوتابخانەدابن وگۆی بۆ مامۆستایەکی هوشیار ڕابگرن گۆیببیستی هەواڵەکان دەبوون بە ئاستەم هەناسەیان دەدا.

کورەکان زیاتر چاوەڕی ئازادییەکی خێرایان دەکرد پێکەوە دادەنیشتن ڕاڤەیان لەسەر رمانی کۆمۆنیست وسەردەمی نۆی دەکرد.

هەر نێرینەیەك نەخشەیەکی بۆ ئایندەی کێشابوو.

زووربەیان کچەکانی هاورپیانیان پشتگۆیخستبوو.

کە گورباتشۆف دەرکەوت وباوەشی کرد بە سەرۆکی ئەمەریکیدا هەموو ئاواتەخوازبوو بە زووترین کات نیشتمانەکەیان ببێ بە پارچەیەك لەئەمەریکا و بترازیتە دونیا و فەنتازیای کە پیتالیستەوە.

لەو رۆژەوەی هەستیان بەبوونی خۆیانکردبوو بە دوای ئەلتەرناتیفیك دا وێڵبوون . ئازادی دونیای کەپیتالیست و قوتاربوون لە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا.

## شەوێکی زستان سەرما

دانیشتوانی دێیکەی لە ماڵەکانیاندا متکردبوو ئەننا گنگلیی تەنیایی وتاسەی ئەلکسەندەری بەرۆح وجەستەدەخوارد باوکی لەنزیك ئاگردانی کەمینە سادەکەی هۆڵی دانیشتنەکەدا ڕاکشابوو وەك سەرما هەرەشە لە سەرتاپاجەستەی بکات بەتانییەکی لەخۆی ئالأندند بوو پشتی کردبووە گەرمای ئاگردانەکە.

دایکی بەتانێکی دابوو بەشانیدا و لاقەکانی بۆنزیك ئاگری ئاگردانە درێژکردبوو.

ئەننا لە بیرکردنەوەیەکی قوڵدابوو .

هیچ کەسێك لەنهینیە ئاڵۆسکاوییەکانی نەدەزانی خودی خۆی نەبێت.

بۆنی سوتاندنی داری نێو ئاگاردانەکە و بێدەنگی نێو ماڵەکە و ڕووناکی کزی گڵوپە کەمهێزەکەی بینمیچی ژورەکە.

دیمەنی شانۆگەریەکی تراجیدیای بێدەنگی دەچووان.

بۆئەوەی بیری دایکی نەترازینی . بەئەسپای پاڵتۆکەی لەبەرکرد و کڵاوی کردە سەر و ملپیچێکی لەمل ئالاند و دەستکێشەکانی کردە دەستی ئامادەی چوونەدەورەوە بوو .

دایکی چاویلکەکەی داگرت و ڕووی لە ئەنناکرد ووتی :

- بەم شەوە درەنگە نێازی چیت هەیە ؟ کەی کاتی پێاسەیە؟
- ناچم بۆ پیاسە..دەچم بۆ لای ئەلکسەندەر

- شەو لەوەی دەمێنیتەوە ؟

- ناچم بۆماڵەوە .

- ئەی بۆ کویٚ ؟

- ئیستا ئەو کەم دەکەوێتە ماڵەوە نەکاتی هەیە بۆ کار و ماڵەوە نەبۆ بینین و ژوانی من .

- ئەی دەچی بۆ کۆی ؟

- دەچم بۆ بارەکە ئیستا بۆتە نیشتەجێی گشت گەنجانی ئەم دێیە بزانم لەوەی بیبینم هەندی قسانی لە تەکبکەم

گەڕایەوە بۆ نێو بابەتە ئاڵۆسکاوەکەی نێو رۆمانەکە ڕوی وەرچەرخان و ئاماژەی ڕەزامەندی پێدا.

شەوە و ئاسمان پڕۆژەی بەفرێکی تەنك بەسەر شەقام ودرخت وخانوەکانی دییەکدا دەبارێنیٚ

تەنیا قروسگەی سەگە برسیەکان و ترپەی دڵی خۆی وخرمەی بەفرەکانی ژێرپێی دەبیست.

چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە لای بارەکە پەنجەرەکانی بەتەمێکی پەنگخواردوەبوو و دووکەڵی جگەرە تەڵخببوون.

ڕووناکی گڵۆپەکانی کپکردبوو.هەستی کرد بارەکە لە خەڵکی جمەی دیٚ.

بەئاگایەوە هەنگاوی بەسەرپلیکانە لوسە بەستیوەکەی بارەکەدا نا.

پاڵی بەدەرگاکەوە نا چیرەی دەرگا کۆنەکە وەك موسیقایەکی ترسناك رژایە نێو ڕووناکی بارەکە ولەتەك چرکەساتی کردنەوەی دەرگاکەدا

***هورشمی چەرەدووکەڵ بەڕوویدا پژاو پێڵوی چاوەکانی تەسککردەوە تاکەمترین دووکەڵ گلێنەکانی بکزێنێتەوە.***

***کەسێك لەدانیشتوانی بارەکە ئاوری لێنەدایەوەدا .***

***مەستی گویگرتنی هەواڵەکانی تەلەفزوین خواردنەوەی فۆدگا وبیرە و جگەرەکێشان ودەمەقاڵی سیاسی نێوانینان بوون .***

***پێکەنینی دوای نوکتەی گاڵەت ئامێزی سیاسی لەسەر کۆمۆنیستی و گەڕەلاوژیەکی ناخۆش بوو.***

***چووە تەنیشت ئەلکسەندەرەوە وەك بە ئاگای بهێنێتەوە دەستێکی خستە سەرشانی ئەویش ئاورێکی لێدایەوە بەساکاری وبێ سۆزیی یەخەی پاڵتۆکەی گرتوو سەری بۆلای خۆی شۆرکردەوە ماچێکی ساردی ڕوومەتی کرد .هەوڵی نەدا لەتەنیش خۆیەوە یان وەك جاران لەسەر ڕانەکانی دایبنیشینێ .***

***ئەمە یەکەمجاربوو بەساردیەوە ماچبکرێت ئەم ماچە سارد و بێ ڕۆحە ڕۆحی ئەنناى هوشیاری بە کۆمەڵە پرسیارێکەوە هەڵواسی و غەم دایگرت.***

***ڕوداوە سیاسیەکان بۆ ئەلکسەندەر و هاورێکانی هێندە سەرنجراکێش بوون ئاگایان لەدونیای ڕۆح وخۆشەویستی وسادەی وپێکەوە ژیانی دیکەیان نەمابوو.***

***ماوەیەك لەتەنیش ئەلکسەندەرەوە بە پێوە وەستا لە چاوەڕوانی سۆزێك بوو.ئەلکسەندەر نە قوومی لەبیرەکەی دایە نەویستی ببێ بەهاوبەشی مێز و گفتۆگۆکانیان لەبەرخواردنەوە و مەستی ونەخشەی***

***داهاتووی ئاگای لەبوونی نەمابوو دووکەڵی پەنگخواردەبووی نێو باڕەکە هەناسەی ئەننای سوارکربوو .***

***چاوەکانی دەکزانەوە لەدانیشتوانی باڕەکەی ڕوانی هەموویان چاو و هەست و هوشیاریان لەسەر ڕووی تەلەفزوینەکە و خواردنەوە وجگەرەکێشان بوو.***

***کاتێك چەند بارە دیمەنی ڕمانی دیواری بەرلین وهەڵهاتنی هەزارەها ئەڵانی ڕۆژهەلات پیشاندران دانیشتوانی باڕەکە وەك سەیری یاری تۆپین بکەن ولەکاتی گۆڵێکدا گشتێان کەوتنە چەپڵەلێدان و یەکێك لەناویاندا بێترس هەستایە سەرپی و ووتی ئیستا کۆمۆنیست ڕما. بێترس قاقایان لێدا.***

***هەستی بەتەنیای وکەمزانین کرد قوپچەی پاڵتۆکەی داخست وملپێچە شلبووەکەی توندکردەوە باڕەکەی بەجێهیشت نە ئەلکسەندەر و نەهیچ لەهاورێکانی ئاوڕیان لێ نەدایەوە.***

***لە یەکەم هەنگا و گەیشتنی بەشەقامەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چەندجارێ وەك هەوای پیس و دووکەڵاوی باڕەکە لە سییەکانی پاکبکاتەوە هەناسەی خێرای دەدا.***

***پرۆشە بەفرەکان بوون بەکڵۆ قوڵای ئاسمانیان بەڕەنگی سپی تاریك کردبوو .***

***بە سەر شەقامە پرچاڵەکاندا بەئەسپایی هەنگاوی دەنا.***

***لەنجەی هاتنەخوارەوەی کڵوبەفرەکان لەقۆڵای ئاسمانێکی بێدەنگ . ببوون بەموسیقایەکی وێنەیی هەنگاوەکانی ئەننا.***

گڵۆپی سەرشەقامەکان هەندێکیان سووکت و هەندێکیان شکاو ئەو گڵوپانەشی بەزیندووی مابوونەوە وەنەوزی ڕووناکێیەکی کەمیان بەشەقامەکە دەدا.

دیمەنی هاتنەخوارەوەی کڵۆبەفرەکانی بەر ڕووناکییە کزەکەکانی گڵۆپەکان ناوەڕۆکی چیرۆکی نیشتمانەکەی هانیە بەرچاو.

ئیستا خەڵکی وەك ئەو گڵۆبەفرانە سەما لەبەر ڕووناکیەکی کزی سیاسی دەکەن وخۆشیان نازانن کەترازانە سەرزەوی لۆژیك . ئاژاوەی سیاسی کۆمەڵگایەکی بێ پرێنسیب چێان بەسەردەهێنی؟

دەبن بەدڵۆپی ئاو یان لە سەرمای بێکاری وبرسیتدا بەبەرگێکی سەهولاّوی و سنگی زەوی ڕۆژگاریان دادەپۆشن؟

کاتێکیش کەمێك ڕۆژهەڵدی دەتوێنەوە دەبن بەچەند دڵۆپی ئاو و بەناخی زەویەکی تاریکدا دەچن چارەنووسیان لەدەستی خۆیان دەترازیت؟

پێشبینی ئەننا بۆ ژیانی نۆی پێشبینیەك بوو ئارامی پیویست بوو .

ئەو بڕوای وابوو بۆسەقامگیری سیاسی وئابوری وولاتێکی فراوانی وەك روسیا کاتێکی زۆری دەوێ ئەوەشی پەلەبکات بەر شەپولی گوڕانێکی ترسناك دەبێتەوە.

وەك لەتەك ئەلکسەندەردا بەڵێنیان بەیەك دابوو هەموو پلانێکی ژیانیان دارێژن و لە زووترین کاتدا پێکەوە دابنیشن بۆ ئایندەیان نەخشەیەکی نۆی بکێشن.

هێنده لەدەوری پرسیارە پیویست و ئاڵۆسکاوەکاندا دەخولایەوە ئارەزووی چوونەماڵەوەی نەبوو ئەو دەیزانی لەماڵەوە کەسێك نیە لەباوەشێکی گەرم ونیانی ڕۆحی بگرێت لە پێخەفە تەنیایەکی کە چەند ساڵە هەناسە وبۆنی جەستەی هەڵمژیووە .

لەماڵەوە تەنیا دایك وباوکی پیر و خانویەکی کۆنی داتەپیوە و کۆمەڵی پەرتووکی چەند جارخوێندراوە.

بەهیوای ئەوەی دوای کەمێك دانیشتوانی بارەکە لەخواردنەوەی ڤۆدگاو پێکەنین وبەزم ماندوو ببن ئەلسکەندەر ببینی .

پیاسەکەی کەمێك درێژکردەوە. چەند جارێك ڕێچکەی گۆڕی لە دووریشەوە دەیڕوانیە دەرگای بارەکە کەسێك لێنەهاتە دەرێ.

ناچار گەڕایەوە ماڵەوە.

باوکی پشتی لە ئاگردانەکە کردبوو تەواوی لەشی داپۆشیبوو دایکیشی ملی بەسەر پەرتووکەدا شۆڕکردبووە دوو پەنجەی خستبووە نێوان پەرەکانیەوە .

ئاگری ئاگردانەکە ببوو بەپشکۆ وچاوی پشکۆکان بە ئاستەم تروسکەیان لە ژێر خۆڵەمیشکەدا دەدا.

ڕووناکی تاقە گڵۆپە زەردە هەڵواسراوەکە سێبەری لەپشت گشت پێکهینەرەکانی ژوورەکە دروستکردبوو.

وەك وێنەیەکی ڕەش وسپی فۆتۆگراف ژورەکە دەبینرا.

بۆنی سوتاندنی داری نێو ئاگردانەکە ووردە پڕخەی باوکی ببوونە چەپکێ ئاوازی بێکەسی ورژانە دەرونی تەنیای ئەنناوە .

**باری دەروون وچرکەی ژیانی ژوورەکەی سەختترکرد .**

**سەرێکی بادا و چوە ژوورەکەی و لەسەر تەختی نووستەکەدانیشت وبیرکردنەوەی ترازایە دونیایەکی ئاڵوسکاو و کۆمەڵە پرسیارێکی ئایندەی خۆی وئەلکسەندەر و نیشتمانەکەیەوە.**

**بەدەم خەیاڵیشەوە ملپیچ و کڵاو پاڵتۆ و گۆرەویەکانی داکەند.**

**بەنیوە ڕووتی لە ژێر تیشکی گڵۆپی ژورەکەیدا وەستابوو لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانیە بارینی کڵۆبەفرەکان.**

**کڵۆبەفرکان گەورەتربوون سنگی شەقامەکانیان سپیترکردوو چاڵەکانیان پڕکردەوە.**

**چاوێکی بەنێو ژورەکەیدا هانی و لەسەر کۆمەڵە پەرتووکە کۆنەکان نێگای هەڵویستەی کرد.**

**پەرتووکێکی بەرگ سووری لیلینی دەرهانی و پرسیاری لێکرد.**

- **ڕەنگە تۆش ماوەیەکی تر کۆچی هەمیشەی لەم ژوور و دیێ و وولاتە فراوانە بکەیت.**

**پەنجاکانی بەقەراغی پەرتووکەکاندا خشاند.**

**پەرتووکە سیاسیەکانی لەڕۆمانەکان جێاکردەوە.**

**لەبەرخۆیەوە ووتی**

- **ئێوە ژیانتان پێکەوە ناگونجی . ڕەنگە لە یەکتری شەرم بکەن ؟**
- **میژووی پێکەوبونتان بەتاوان بنووسنەوە ؟**

**جەستەی نێوەڕووت بوو.**

سەرمایەکی ئاستەم ڕاپچڵەکان بۆگەرمکردنەوەی شانی ڕووتی لەپی دەستەکانی بەلەشیدا خشاند .

هەستێکی نامۆ ڕۆحی ڕاچڵەکاند .

بەنیازی بینینی وێنەی ئەلکسەندەر چاوەکانی نوقاند .

هیچی نەبینی تەنیا پەردەیەکی ڕەشی قەترانی زیاتر. وەك بیری لەپی دەستەکانی ئەلکسەندەری هاوڕێ بکاتەوە. ئاوا حەزی بەخشاندنی لەپی دەستی خۆی کرد.

ئاورێکی شەرمنی لەئاوینە تەڵخە کۆنەکەی دا بەزەیی بەجوانیە تەنیاییەکەی خوێدا هاتەوە.

گۆپکەکانی مەمکی سور و گۆمەزەکانی کاڵێکی کەمخوین جوانیەکی نازداری پێبەخشیبوو.

لەبەرخۆیەوە ووتی :

- چ نرخێکی هەیە ئەم جەستە جوانە بەتەنیایی؟

کاتێك جواندەنووێنم کە ڕەنگی جەستەم تێکەڵاوی ڕەنگی جەستەی ئەلکسەندەربێت. تووکەکانی سەرسنگی زبری پێش مژینی گۆپکەکانم گۆپکەکانم ختوکەبدەن .

لەو ڕۆژەوەی حەز لە لا بزوابوو یەکەم پەنجەی زبر و لێووە توکاویەکانی ئالکسەندەربوون ترسی مژینیان شکاندبوو.

ئەو بوو خۆشترین چێژی سروشتی پێبەخشیم.

چەند جوانە کاری خوا مرۆڤەکانی بەشێوەیەك دروستکردوە کە نێرومێ شەیدای یەك بن؟

ئەننا پەروەردەی ڕەوشتێکی سادەی دێیەکی کولتوری ڕەسەنی جوانی روسی بوو بۆیە لە شەرمی کولتورەکەی لەپی دەستەکانی لەجەستەی دورخستەوە.پەڕەی پەرتووکەکان چاویان لەشەرمی ئەننادا داخست .

خویخزانده ژێرلێفەکەیەوە.

بەکۆمەڵی پرسیاری ئاڵوسکاوە سەری نایە سەرسەرینەکەو وەنەوز چاوەشینەکانی بەئاستەم دەتروکاند.

لەژێرلێفەکدا وەك باوەش بەحەزەکانیدا بکات کەمێك نوشتایەوە دەستەکانی خستە نێوناوگەڵی وپەنجەی بەتووکە ئاڵۆسکاویەکاندا خشاند و ترازانەیە نیوهەردوو لێوی بەرمۆسەلانی .

نەگەرم بوون و نەلینجاوی دەردابوو.

بەهیوای بەیانێکی نۆی وبینینی ئەلکسەندەر و دۆخی نۆی وولاتەکەی . خەوی لێکەوت.

تاڕووناکی ڕۆژ بەرەنگێکی شینی کاڵ خۆینیشانی دییەکەنەدا .

بارەکە چۆڵنەبوو.

هەرکۆمەڵە کەسێك خاوەنی برِیارێك بوون لێ گشتیان لەیەك خالْدا هاوبەشبوون .

برِیاریاندابوو ئەو شەوە نەنوون بەیانی زوو دیکەیان بۆ هەمیشە بەجێبهێڵن و ڕووبکەنە شاری سانپیترسبۆرگ و مۆسکۆ وئەودالْی کەپیتالْ و فەنتازیای کۆمەلگای سەرمایە بن .

ئەلکسەندەرکەسێك بوو لەدمانگیرترین خاوەن پرۆژەی جێهشتنی دیکەیان . بۆ ئەو مەبەستە لەتەك چەند هاورێکیدا بڕیایراندا ئەو شەوە نەنوون بەیانی زوو دیکەیان بەجێبهیڵن.

چەند پیسە کەپیتاڵ زۆران لەتەك ڕۆحیش دەگرێ . ئەوە مرۆڤە موراڵ لاوازەکانن لە زۆرانی کەپیتاڵدا لاوازدەبن.

لەناو دیکەیاندا چەند تراکتۆرێك وتاقە یەك ئۆتۆمۆبیلی مۆسکۆفیچی کۆن هەبوو . بۆگەیشتن بەنزیکترین شەقامی سەرەکی ئەوانەی بڕیاریاندابوو دێکەیان جیبهێڵن خۆیان و چانتاو کەلوپەلەکانیانەوە وەك تۆپەڵە میرۆلەیەکی دەوری نقوڵێکی تەڕ دەوری تراکتۆرەکە و مۆسکۆفیچەکەیاندابوو.

ژمارەی ئەوانەی دەوری مۆسکۆفیچەکەیاندابوو شەش کەس بوون لەتەك خاوەن ئۆتۆمبیلەکەدا لە دەمەقاڵی ئەوەدابوون.

لەچوارکەس زیاتر هەڵناگرێ پێچکەکانی کۆن ولاواز وبرغوکانی ژەنگاوی ڕەنگە لەنێوەی ڕێگا پەکیان بکەویت . بەپاڕانەوە وتکاخاوەنی مۆسکۆڤیچەکەیان ڕازیکرد ناتاشاو سیرگی هاوڕێ ئامادەنەبوون بچنە کۆڵی تراکتۆرەکەوە.

ناتاشا چوە کۆشی سیرگی هاوڕێ لەتەنیش شۆفیرەکەوە .

چوار کەسیش خۆیان تراجاندبووە کۆشونی پشتەوە.

مۆسکۆفیچەکە بەئاستەم کەوتە ڕێگە و شوفیرەکە بەئەسپای لەچاڵەکانی نێو شەقامەکەی دەدا.

ناتاشا هاوڕی ئەننا بوو کە گەیشتنە نزیك ماڵی ئەننا.

بە ئەلکسەندەری ووت .

- ئەلکسەندەر ئەننا بەم سەفەری تۆ دەزانی ؟

ئەلکسەندەر بەساردیەوە ووتی

- نە

- کارێکی جوان نیە بۆ پێتنەگووت کێ دەڵێ وەك من و سیرگی بڕیارتان یەکنەدەبوو پێکەوە سەفەرتان بکردایە؟

قسەکانی ناتاشا ڕۆحی ئەلکسەندەری ڕاچڵەکان وبەخێرای ودەنگی بەرزەوە بە شوفیرەکەی ووت تکایە بوەستە .

ئۆتۆمۆبیلەکە وەساتا .

ئەلکسەندەر بەڕاکردن وهەنگاوی پەلەی بەنێو بەفرەکەدا دەنا خرمەخرمی شکاندنی بەفرەکانی ژێر پێ چەپکە نۆتەیەکی خەم وشەرم بوون وتێکەڵاوی پەشیمانی هەستی ئەلکسەندەر دەبوونن.

وەك کەسێکی ئاشنا بە ماڵی ئەننا خۆیکرد بەماڵێاندا و باوك ودایکی ئەننا لەدەوری ئاگردنەکە دانیشتبوون چایاندەخواردەوە ئەلکسەندەر بەیانی باشێکی سادەی لێکردن چووە ژورەکەی .

ئەننا لەسەرسنگ خۆیدابوو بەسەر پێخەفەکەیدا و لەئامێزی خەوێکی ئارامدا هەناسەی دەدا.

لێفەکەی لەسەرئەننا لادا .

ژێرکراسەکەی بۆ سەرەوە هەڵکشا .

گۆی سمتەکانی وێنەیەکی نازداری بە یادگارەکانی ئەلکسەندەر دا.

ژەمە سێکسیەکانی هاتەوە یاد.

***ئەلکسەندەر هێندە شەیدای شاربوو خۆی تەسلیمی یادگاریەکانی نەکرد بەئەسپای نوشتایەوە ماچێکی سەری ئەنناای کرد شانی ڕاچڵەکاند.***

***ئەننا بەئاگابووە.***

***کەچاوەکانی کردەوو قژە ئاڵۆسکاوەکانی سەری ڕووی لادا.دیمەنی ڕووی شڵەژاوی ئەلکسەندەر سەرسامیکرد.***

***ئەلکسەندەر ماچێکی کردو بەپەلە ووتی***

***- گوڵەکەم من دەچم بۆ سان پیترسبورگ . بە دوای ژیانێکی خۆشتر بۆ هەردووکمان دەگەڕێم لە کەمترین ماوەدا دەگەڕێمە و بۆ لات و لەتەك خۆمدادەتبەم بۆئەوی.***

***- لەوی ژیانی خێزانیمان مسۆگەردەکەین.***

***ئەلکسەندەر هێچ بۆاری وەڵامدانەوەی نەداو دوای تەواوبوونی ڕستەکانی ماچێکی تری پەلەیکروو ماڵئاوی لێکرد.***

***ئەننا چووە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی کەدەیڕوانی بەسەر شەقامەکەدا بینی وا هاوڕێکانی دێکەی بە کۆمەڵ خۆیان لەسەرعەرەبانەی تراکتۆرەکە و ناو مۆسکۆفیچەکەش لەدوورەوە تاریکی دەنوان زانی ناو ئۆتۆمبیلەکەش پڕە لەهاوڕێکانی.***

***تراکتۆرەکە لەپشت مۆسکۆفیچەکەوە بوو پانتای شەقامەکەش هێندە نەبووکە پێش مۆسکۆفیچەکە بکەویت بۆیە دەبوایە گشتیان چاوەڕی ئەلکسەندەربکەن.چەند دەستێك لەدانیشتوانی تراکتۆرەکە وپەنجەرەی مۆسکۆفیچەکەوە ئاماژەی سەلامیان بۆ پەنجەرەکەی ئەنناکرد.***

چاوی لەشەقامەکە بڕی ووردە ووردە دیمەنی مۆسکۆفیچەکە وتراکتورەکە لەبەردیدەیدا نەمان چاوەکانی هەرلەسەر شوێن پێچکەی مۆسکۆفیچ وتراکتورەکە وڕمابوو.

گەڕایەوە لەسەر تەختی نووستنەکەی دانیشت وهێندە لەتەك پرسیارەکانی خوێدا مەست بوو هەستی بەسەرمای جەستەی نەکرد.لەدوای هەرسهێنانی ڕژێمی کۆمونیستی و دیوارەکەی بەرلینەوە هەرەسی هیوا و نەخشەی منیش دەستی پێکرد.

ڕەشبینی بوو بە بڕوای . لە ئایندەی نیشتمان ومیللەتەکەی دەترسا . کاتە تەنیاکانی بەبیرکردنەوە بێدەنگی وخەمەوە بەرێکرد. لەچاوەڕوانی نامەیەکی ئەلکسەندەربوو.

ڕۆژێکی سەرتای بەهاربوو گەرمایەکی کەم ڕووی سروشتی جوان ڕەنگاڵەی کربوو کەش و هەوا خۆش ببوو ڕوەك وگوڵ ئەنداماني باخچە خنجیلانەکەی پشتی ماڵیان ڕەنگ و ووزەی سەوزیان پۆشیبوو. لەنێو باخچەکەی پشتی خانوەکەیاندا سەرگەرمی پاککردنەوەی رووەکە کێویەکان بوو . دەنگی لێدانی دەرگاکەیانی بیست .

ڕوانیەشەقامەکە ماشینێکی بمفی ژەنگهەڵهاتووی کۆن لەبەرماڵەکیاندا وەستابوو. دەرگاکەی کردەوە ناتاشای هاوڕێ بەحل وبەرگێکی مۆدیرن و چاوی ماسکارا ولێوی سور پێڵاوی بەرز پاڵتۆیەکی تەنکی رەش و شاڵێکی گرانبەهای لەملدابوو .

ناتاش چونكە هاورێەكی دڵسۆزی تەمەنی بوو گۆیندایە بەرگە كۆن ودەستە پیسەكانی ئەننا باوەشی پێداكردو هەروەك سەردەمی قوتابخانە ماچیكرد .

دیمەنی نۆی ناتاشا ئەننای سەرسامكردبوو.

وەك دوو هاورێ دڵسۆز پێكەوە چوونە ژورەوە لەتەنیشت یەكەوە دانیشتن.

ناتاشا دەستیكرد بە چانتاكەیدا200دۆلاری دەرهانی لەتەك نامەیەكدا دایە دەست ئەننا.

ئەننا یەكەمجاربوولە ژیانیدا دۆلار بە دەستەوە بگریت.تەنیا لەوینەدا بینیبوی .

ناتاشا ووتی.

- ئەمە نامەی ئەلكسەندەرە و ئەمەش دیاریە بۆتۆ.

ئەننا هێندە تامەزروی هەواڵی ئەلكسەندەربوو.نرخی بە200دۆلارونامەكەنەدا كەوتەپرسیاركردنی لە ئەلكسەندەر

- ناتاشا ئەلكسەرندەر لەكۆیە؟

- تۆدەیبینی؟

- چ كاریك دەكات؟

- بۆدەنگی نیە؟

پرسیارلە دوای پرسیاردەیكرد و چاوەڕی وەڵامی نەدەكرد.

ناتاشا لەو هەستەجوانەی ئەننا گەیشت و بەئارامیەوە وەڵامی گشت پرسیارەکانی دایەوە دڵخۆشیکرد بەوەی ئەلکسەندەر کاردەکات و سان پیترسبۆرگ گۆرەپانی پارەپەیداکردن وژیانە .

سوپاسی یەزدانی کرد کە لەسەردەمی ڵاوی ئەماندا کۆمۆنیست هەرەسیهانی و تەمەنیان وەك چەند نەوەیەکی پێش ئەمان نەبووبە قوربانی.

چەند ڕۆژیك ناتاشا لە دیکەیان مایەوە زووربەی ساتەکانی لەتەك ئەننادا بەسەردەبرد.دوا ڕۆژ ژمارەی تەلەفوون و ناونیشانی خۆی بەئەننادا.گەڕایەوە بۆ سان پیترسبۆرگ

ماوەی چەند مانگێکی بەسەرچوو هیچ هەواڵێکی لەئەلکسەندەر و ناتاشاوە پێنەگەیشت.ئۆقرەی چاوەڕوانی هاتە کۆتایی و ڕۆژێك چوو پۆلیسخانەی دێیەکی گەورەتر لەدێکەی خۆیان تکای کرد ڕێگەی بدەن تەلەفونێکی کورت بۆ سان پیترسبۆرگ بکات کابرای پۆلیس ڕێگەی نەدا بۆیە ناچار ئەننا 150 ڕۆبڵی دا بە پۆلیسەکە کەمێك تەلەفوونی لەتەك ناتاشادا کرد . هەرچەندە بەگوبیستی یەکتری دڵشاد بوون .

لێ کەپرسیاری لە ئەلکسەندر دەکرد ناتاشای خۆی لەپرسیارەکە دەدزیەوە ئەننا هەستی بە درۆی وەڵامەکانی کرد.

هوشیاری و هەستەکەی بەرامبەر بە ناتاشای هاوری و دڵسوزی و خورپەی ڕۆحی بۆ بێ هەواڵی ئەلکسەندەر ترسێکی قەبەی ڵاکەڵەکەکرد گەڕایەوە بۆدیکەیان ئەو شەوە ناخۆشترین ساتەکانی ژیانی بوو.

بێدەنگێکەی گریانێکی زۆر بەکوڵبوو تەنیا دایکی هەستی پێدەکرد . لەتەك دایکیدا کەوتنە دووان گرفتەکەی پێووت.

بڕیاریدا بۆ سۆراخی ئەلکسەندەر سەردانێکی سان پیترسبۆرگ بکات .

دایکی پێووت :

- کچم ئەم سەردانە پارەی دەوێت ئێمەش ئەوپارەیەمان نیە.

ئەننا تا ئەوساتە لەتەك دایکیدا باسی200 دۆلارەکەی نەکردبوو.لەنێو یەکێك لەپەرتووکەکاندا 200 دۆرەکەی دەرهانی و نیشانی دایکی داو و دایکشی وەك ئەننا بۆ یەکەمجاربوو دۆلار ببینی100دۆلاری دا بەدایکی 100بۆ خۆی هەڵگرت

دایکی وەك لەتەك دۆلارەکدا بدوێ. سەیری ئەم دیو و ئەودوی کرد ئەننا ووتی

- دایکە منیش یەکەمجارە دۆلار دەبینم . پارەیەکی سەیرە .
- بۆ وا بەدیقەتەوە سەیری دەکەیت ؟
- بەدیقەتەوە سەیری دەکەم چونکە ئەم پارەیە فاکتەری گشت جەنگە خویناویەکانی دونیایە.ئەمە مرۆڤەکان لە مرۆڤەوە دەکات بە دڕندە.

- دایکە ئۆقرەم نەماوە ئارامییم پساوە بڕیارمداوە بەیانی سەردانی سان پیترسبۆرگ بکەم.

- تۆ ئافرەتێکی زۆر شۆخی وبەتەنیا چۆن دەوێری بچی بۆ شارێك دەڵی شارەمیرولەیە ؟ من لەژیانمدا دووجار ئەوشارەم بینیوە ئەو ساتانەش وەك ئیستا جەنجاڵ نەبوو . ناترسی ؟

- تەلەفوونم بۆ ناتاشا کردوە ناونیشانەکەی دەزانم ئەو وەك خوشکم وایە دڵنیام لەوەی کۆمەکم پێدەکات.

- گرِی ئەم سەفەرەت تەنیا ئەلکسەندەر؟ یان تۆش ئارەزووی ژیانی دیکەمانت نەماوە؟

- بەڵی دایە .تەنیا ئەلکسەندەرە زۆر دەمێکە لەتەك گریاندا دەژیم .

- تۆ دڵنیای ئەلکسەندەر تۆی لەیاد نەکردوە ؟

- دڵنیام دایە.نامەیەکی بۆ نووسیوم گشت هیواکانمی سەوزکردوە من بەو هیوایانەوە لە چاوەڕوانیدام کە تەلەفوونم بۆ ناتاشا کرد لەوەڵامەکانیدا هەستم بە ترس و سێبەری درۆدەکرد .

دایکە ئیستا بێ یان سبەی یان ساڵێکی تر دەبێ بزانم من چیدەکەم ؟ بەخۆشەویستی تۆوباوکم وهیواکانی ئەلکسەندەرەوە لەم دێیەدا دەژیم لاوەکانی گشتیان سەفەریانکردوە بۆ مۆسکو و سان پیترسبۆرگ.

مافی خۆمە پرسیار لەئایندەی خۆم بکەم . دەبێ ئەم سفەرە بکەم .

- برِۆ.من دەزانم هەمووشەوێك وەنەوزی چاوەڕوانی دەتخەوینی لەتۆ تێدەگەم چونکە منیش بەشێك لەژیانم چاوەڕوانی بوو.پێشکەش بەباوکتم کرد. سەردەمی ئێمە سەردەمی کوشتنی مرۆڤ وهەموو شتەجوانەکانی سروشت بوو . درخت . مرۆڤ . ئاو . تەنانەت ماسییەکانی قوڵایی دەریاش لەتاوانی جەنگ رزگاریان

نەبوو ئا لەوتەمەنە جوانەی مندا من چاوەڕوانبووم چاوەڕوانی من وەکی ئەوەی تۆ نەبوو من چاوەڕوانیەکی پڕترسدا دەژیام هەرچەند هەواڵەکان گشتی دڵخۆشکەربوون بۆسەرکەوتنی سۆڤێت لێ دەمزانی سەرکەوتنیش بەکوشتنی مرۆڤ وخوێنڕشتن نەبێت مسۆگەرنابیت.

- هەمیشە لەدڵە لەخورپیەی باوکتابووم. قینم لەکاتی چاوەڕوانی نەبوو قینم لەجەنگەکەبوو.لەکوشتن بوو.ئیستا تۆچاوەڕوانی چاوەڕوانیەکەی تۆلەهی من ناکات.ئەوساتانەی چاوەڕێ باوکتم دەکرد نەمدەتوانی وەك ئیستای تۆ بەدوای باوکتا بگەڕێم . ئیستا تۆ ئازادی دەتوانی شاربەشاری ئەم وولاتە بەدوای ئەلکسەنەردا بگەڕێت .

ئەننا قسەکەی بەدایکی بڕی ووتی :

- دایکە من پێموایە دوای نەمانی شەڕی سارد.شەڕی نێوان بەرژەوەندیەکان سارتر نابێت ؟ بەڵکۆ جەنگێکی گەرمی خۆیناوی کپ وبێدەنگ دروستدەبێت .

دایکی بەهوشیاری کچەکەی دڵخۆش بووچاوەکانی کەمێ ئاویتیزاو سەری نابەسنگیەوە ووتی:

- کچم منیش دەزانم ئەنجامی ئەم گۆڕانە چیدەبێ . چۆن جەنگی گەرم جەنگی ساردی کرد بەپاشکۆ وملوینەها مرۆڤی برسیکرد کۆتایهاتنی جەنگی ساردیش جەنگێکی تری خوێناوی بەدوادیدا دێنێ.پێموایە جەنگی برسیکردنی گشت مرۆڤایەتی دەبێ.

- بەهوشیاریت دڵشادم لێ ئەوەش بزانە ژیان بێگرفت ناخۆشە.ئەوسیستەمەی کەباس لەیەکسانی مرۆڤەکان دەکات زۆرخەیاڵیە تەنانەت خودی مارکسیەتیش ڕۆمانسیانە دەیڕوانیە ژیان وکێشەکانی مرۆڤ .
- کێشەی کار و سەرمایە.ڕەنگە لەکۆمەڵگایەکدا جۆرێك سەقامگیربوونی هەبێ . لێ نەك لەسەرجەم جیهاندا.من پێموایە هوشیاری و ڕۆشنبیرکۆمەڵگا شانس بەئارامی کۆمەڵگا وسەقامگیری کێشەی نێوان کارو سەرمایە دەبەخشێ . نەك تەنیا قسە ونوسین.ئەمە سروشتی مرۆڤە قەبارەی گرفتەکانی مرۆڤ هێندە فراوانە چارەسەری لە ئاستی هوشیاری و توانای گورباتشۆف وڕێگاندا نیە.
- ئیستا سەردەمی پاراستنی بەرژەوەندی تاکە بۆیە تاکەکان هەوڵی یەکتری خواردن دەدەن . ئاگات لەخۆت بێ , ژیانی دوای ژان زۆر خۆشە کچم تۆ نازانی من چەند ئازارمخوارد لەچاوەڕوانی باوکتدا.چەند ئازارمخوارد لەکاتی لەدایك بوونی تۆدا تۆ منداڵت نەبووە لە ئازاری منداڵبوون ناگەیت هەندی جار ئافرەت ناوگەڵی دەقڵیشێ دواجار ئەو باوەشە خۆشەی بەکۆرپەکەیدا دەکات.هەموو ئازارێکی سارێژدەکات.ساڵێك چاوەڕی ماچێکی باوکت بووم .
- کە گەڕایەوە لەیەکەم شەوی جووتبونماندا گشت ئازارەکانم لەبیرچووە.کچم برۆ لێ من وباوکت لەیاد مەکە.

- ویژدانت فەرامۆش مەکە.مرۆڤ بەمۆراڵ و ویژدانی جوانەوە جوانە زۆرکەس پرسیار لەخوا دەکەن وکەسیش وەڵامێکی ڕاستی پێی نیە, من وەڵامێکم بۆ پرسیارەکانی خۆم لە بوونی خوا ئامادەکردوە. ئەویش ئەوەیە ئەو مرۆڤەی دڵ ودەرون و موراڵ ویژدانی جوانی ومرۆی بێت لەخواوە نزیکە خواش کۆمەکی پێدەکات.جەرەکەم تۆدەچیت بۆشارێك تازە بۆتەکۆرپەی بێزمانی کەپیتال.ئێمەی ڕوس زۆرکاتمان گەرەکە تا لە کەپیتال و سیستەمەکەی و زمان و پاشقولەکانی بگەین.خودی کەپیتال کرۆکێکی بێ ئۆقرەی بزیوی هەیە دەبێ مرۆڤ هوشیارانە مامەڵەی لەتەکدا بکات

(ئاورێکی بەلای پەرتووکە زورە پەرش و بڵاو کۆنەکاندا دایەوە ) ووتی:

- کچم تۆ دەزانی من دەرچوی زانکۆی مۆسکو بەشی ئۆکۆنومیم دەزانم کەپیتالست چ کرۆکێکی تورەی بێ بەزیی هەیە .
- هەندی جار ملاین مرۆڤ دەبێتە قوربانی بەرژەووندی چەند کەسانێك . کۆمپانییەك ئەمە سیستەمە کاتی خۆی لەتەك باوکتدا لەسەر ئەوە زۆردواین ئەو ئەفسەرێکی بێدەنگ بێت ومنیش مامۆستایەکی تووتی لەو وانە زیاتر کە پێمان ووترابوو زیاتر ڕاڤە نەکەین , ئێمە سەرەتای ژیانمان لە سان پیترسبۆرگ بووین.هەڵهاتین بۆئیرە لێرە لەتەك سروشتێکی ئاسیی

وكۆمەڵگایەكی سادەی دیهاتی بووین بەهاوڕی.لەشاری جەنجاڵدا مرۆڤەكان سەریان ناپەرژیتە خۆشەویستی.

- دەزانم سان پیترسبۆرگی كۆن ونۆی جیاوازن لێ جیاوازییەكان لەسەردەمی تۆدا ترسناكترە چونكە بازار جڵەوی بەدەست چەند كەسانێكەوەیە نەك سیستەمیك.

- من ناترسینم ئامۆژگاریت دەكەم دەزانم تۆ هوشیاری لێ ژیانی ئەوشارە هوشیاری زیاتری گەركە وەك دایكێ دەبێت دڵسۆزت بم تۆ تا نەبیت بەدایك لەخۆشەویستی من ناگەیت.

- زۆردەمێك بوو كۆمەڵە پرسیاریك لای من كەڵەكەبوو لەكاتی جەنگی ساردا كۆمۆنیستە سەقەتەكەی ئێمە ڕاستبوو یان كەپیتالیستە بێوژدانەكەی ئەوان ؟

- تاخانەنشینكرام لەهیچ شوێنیك نەمدەوێرا ئەوپرسیارەبكە.چونكە دمزانی وەڵامەكەی كۆمۆنیستەكەی ئێمەیە.كەواش نەیەئیستاش ئەوپرسیارەهەرزۆر نۆیە.

- ئایا كەپیتالیست دەتوانی گشت ویستەكانی مرۆڤ مسۆگەربكات؟ من لە جێگەی خۆمەوە دەڵیم نا سیستەمی كەپیتالیست یانی سیتەمی خواردنی ئەندامە بێهیز و پچوكەكانی كۆمەڵ ئێمەش وخێزانی تریش دەبین بەخواركی چەند سەرمایەدارێكی گەوجی نۆی روسی چونكە كەپیتالیست پیویستی بەهوشیاری هەیە ئێمە لە هیچ قوتابخانە وزانكۆیەكدا كادیری وامان پەروەردەنەكردوە بتوانی هوشیارانە مامەڵە لەتەك كەپیتال و بازاری ئازاددا بكات

کچم دەزانم ئەم کێشەیە بەمن وتۆ چارەسەرناکرێت .دەتوانین خۆمان نەکەین بەخۆراکی ئەو نەهەنگانەی لەداهاتوودا دروست دەبن.برۆ ئاگات لەخۆت بێ سان پیترسبۆرگ دەریایەکی فراوانە پڕیتی لەنەهەنگی برسی .

- تۆش ماسییەکی ناسك و نازدار و شۆخێکی مەمەك خڕو جەستە نەرمی . گۆشتی جەستەی تۆ بۆ حەزی ئەوان زۆر شیرینە ئاگات لەخۆت بێت. نات ترسینم تۆ نازانی تۆ بۆ من وباوکت چیت؟زۆرتر لەکچێك تۆ پارچەیەك لەجگەر و یادگاری من وباوکتی .دەزانم گرفتت دەبێ گرنگ ئەوەی بە هوشیاریەوە بەرنگاری گرفتەکانت ببیتەوە .

- گرفت لەوەدا نیە مرۆڤ بترازیتە چاڵێکەوە.گرفت لەوەدایە مرۆڤ چۆن لەو چاڵە بێتەدەرەوە.ئەمە فەلسەفەی بەرنگاربوونەوەی گرفتەکانی ژیانە.رۆحی ئازای مرۆڤە ئازاکانە.ئەو مرۆڤانە بەختیارن بۆ ئازادی ژیان خەباتدەکەن.لەئاست گرفتەکانی ژیاندا چۆکدانەدەیەت.کەزۆرانت لەتەك گرفتیکدا گرد سەرکەوتنت بەختیاریت پێدەبەخشێ .لەژیاندا ئازاد دەبیت.ژیان بێ ئازایی و ئازادی کۆیلەبوونە .

هەردوکیان باوەشیان بەیەکدا کرد .بۆیەك گریان .

- دایەگیان من بەشێکم لە ئێوە . ئێوەش بەشێکی پیرۆزی ژیانی منن ئەوەی شانازیمە من قوتابی ڕەوشتە جوانەکانی ئێوەم .

***وەك گەرەكی بێ كەمێك غەمی دایكی برەوێنێتەوە  سەیرێكی دەستی دایكی كرد بینی دوو پەنجەی لەنێو پەڕەی ڕۆمانەكەی نێودەستیدا داناوە.بەپێكەنینەوە ووتی***

- ***دایكە پێمنالێ چەندجارئەم ڕۆمانەت خۆیندۆتەوە؟***
- ***كچەكەم ئەوەی لێتیرناخۆم بەرهەمە كلاسییكیەكانی ئەدەبی رووسیە.هەر دوای ماوەیەك تێپەربوون بەسەر خۆێندنەوەیاندا زۆرحەزدەكەم پچمەوە ئامێزی ئەونوسینانەی بەسەلیقەوە بۆ ژیان نووسیویانە .***

***ئەم بەرهەمانە  نەتەوەی روسیان بەجیهان ئاشناكردوە.***

**بەیانییەکی رۆژێکی تەماوی**

تیشکی خۆرسنگی زەوی ولقی درخت وسەرتاپای جەستەی دێکەی مەساجدەکرت تەمێکی سپی ڕۆمانسی ڕووی سەرەتایی ڕۆژەکەی جوان کردبوو.

ووزەبەخشی کار وچالاکی بوو دانیشتوانی دیێ وەك هەمیشە بەئارامی لەبەرچای خواردنی بەیانیاندابوون. لە لولەی زۆپای هەندی خانووە دەزووی باریکی دۆکەڵ تێکەڵ بە هەڵە تەنکەکەی سەرپۆشی ئاسمانی دیکە دەبوو.

ئەننا دوای گفتۆگۆکانی لەتەك دایکیدا کەلوپەل و جل و بەرگەکانی لە نێو جانتایەکدا کۆکردەوبووە.

لەنان خواردنی بەیانیاندابوون .

دڵەخورپەی دابڕانی سێ رۆحی پاکی ئاشنا بەیەك هەناویانی گریدابوو. شەو دایکی هەواڵی سەفەرکردنی بە باوکی ووتبوو بۆیە باوکی بە بێدەنگی پارۆەکانی دەجوو بەگرانێکی کپەوە پیاڵە چاکەی هەڵدەگرت ئەو دەیزانی سەفەرکردنی و بەجێهیشتینی دایك و باوکی بۆ هەرسێکێان زۆرسەختە.ئەمەویستی ژیانەوە دەبێ بیکات.دڵی بە خەفەت گیرابوو وەك ئاسای نەیدەتوانی بەرچایی بکات.

هەستایە سەرپێ لەبەر باوکیدا وەستا باوکی بەدانیشتنانەوە سەرێکی بۆبەرزکردەوە.دوای کەمێك ئەویش هەستایە سەرپێ وچاوەکانی باوکی تەربوون.باوەشیان بەیەکتریدا کردو باوکی چانتاکەی دایە دەستی پێووت

- کچم من له ڕەوشت و هوشیاری دایکتەوە هەموو بروایەکم بەتۆ هەیە . دایکت گشت شتێکی بۆ گێڕامەوە من هیچ شتێکم لەوەتەکانی دایکت جوانتر پێ نیە ئەوەندە بزانە ئێمە تۆمام زۆرخۆشدەوی. خوات لەگەڵ کچم. ناوچەوانی مچکرد.

باوەشی بەدایکیدا کرد قوڵپی گریانەکانی خواردەوە توانای تاقە ووشەیەکی نەبوو .وەك منداڵیکی ساوا تێر بۆنی جەستەی دایکی هەڵمژوو و بەچاوی پڕ فرمێسکەوە ماڵی بەجێهیشت.

جانتاکەی بەگرانی بۆ هەڵدەگێرا وجەستەی بەلای جانتاکەدا لاربببووە. بەنیازی گەیشتنی بەجادەی قیر وئیستگەی پاس ڕێگەی گرت.هەرکاتێك کوڕێکی گەنج کیژێکی شۆخ دێکەی بەجێدەهێشت دانیشتوانی بەتەمەنی دێکە خورپەیەکی تەنیا لەڕۆحیان هەڵدەسا.

دراوسیەخاوەن مۆسکۆفیچەکەیان کەبینی وائەنناش دیکەیان بەجێدەهێڵێ خەمی ئەوەیان لێنیشت لەئەنجامدا ئەم دێیەدەبێتەخانوویەکی گەورەی مرۆڤە پیرەکان.

بۆگەیشتن بەجادەی قیر دەبوایە هەندی بەپێ بڕۆشتایە.بۆیە دراوسیە دڵسۆزەکەیان کەبینی وائەننا بە چانتایەکی قورسەوە بەرەو جادەی قیردەڕوات.

خێرا پاڵتۆیەکی لەبەرکرد وبەخێزانەکەی ووت ئیستا دێمەوە.سلفی لەمۆسکۆفیچەکەدا تامەکینەی مۆسکۆفیچەکە گەرمراهات و توانای لێخوڕینی لادروستبوو .

ئەننا لەچاوی دێکە وونبوو.

دراوسییەکەیان بەدوای ئەننادا لێخوری ولەڕێگە پێ گەیشت.سواریکرد قورسی جانتاکەی و دووری ڕێگاکە ماندوی کردببو سەری کوڵەکانی سور وچاوەکانی کراوە پەیتا پەیتا لووتی دەسڕی.کەمێك لەنێو ئۆتۆمبیلەکەدا حەوایەو دواجار سوپاسی دراوسیەکەیانی کرد پێووت.

- ڕێکەوتێکی جوان بوو زۆر سوپاس یارمەتیدام . نیازی کۆیت هەیە بەم بەیانی زووە ؟

دراوسیەکەیان ووتی

- نا کچم ڕێکەوت نەبوو نیازی هیچ شوێنیکم نیە کەبینیمیت تۆش دیکەمان جێدەهێلی وجانتایەکی قورس و تەنیا ودەزانم تا گەیشتن بەجادەی قیر ئیستگەی پاسەکە زۆرت گەرکە.ئارەزووم هەبوو یارمەتیت بدەم بەهیوای ئەوەی تۆدێکەمان لەیادنەکەیت چونکە خێزانی ئێمە و ئێوە یادگارێکی درێژی تەمەنمان پێکەوە گرێداوە .

چاوەکانی فرمێسکی کاڵی تێزا قورسای دەرونی ڕێگەی چەند ووشەیەکی نەدا.

نیگایەکی پڕخۆشەویستی وسۆزەوە چاوەکانی لەچاوی دراوسییەکەیان بڕی وهەردووکیان لە پرسیار و وەڵامەکانی چاوی یەکتری گەیشتن.

دراوسییەکەیان ووتی:

- کچم ئێمە هەمووومان وەك خێزانیك واین ڕاستە ئێوەی گەنج هیوای دیکەمان بوون لێ ئەمە ژیانە گوڕان هاتوە هیوادارم نەوەی داهاتووی ئەم ووڵاتە وەك ئێمە ژیانی سەخت نەبێت. دەبێ چاوەڕێ بکەین .

- دەتوانم بپرسم ئامانجت لەم سەفەرچیە.؟

بێ وەستان

- وێڵی ئەلکسەندەرم. ماوەیەکەدەنگی نیە.

سەیرێکی پڕ سەرنج وپڕ ڕێزی بۆ بادا ودەستێکی لەگیرەکە بەردا ودەستی ئەننای گوشی و پێووت

- ئەمە جوانترین ڕەوشتە و وەفایە بەهیوام لەتەك ئەلکسەندەردا بەئامانجتان بگەن.ئەو ڕۆژەی کە ئەلکسەندەر و هاوڕێکانیم گەیاندە شوێنی ئیستگەی پاسەکە ئەلکسەندەر دوای پچڕاندنی لە تۆ بۆ ماوەیەك زۆر تاسابوو.

- دەزانی ئەو لە کۆیە؟ .

- نەخێر ماوەیەك لەمەوبەر بە ناتاشادا نامەیەکی بۆ ناردم ئیستا دەچم بۆ لای ئەو ..... ئەوشوێنی دەزانی.

بەدەم ڕاڤەکردنەوە گەیشتە ئیستگەی پاسەکە و ئەننا جارێکی تر زۆر سوپاسی دراوسییەکەیانی کرد.

لەسەر کورسی ئیستگەی باسەکە دانیشت . هەناسەی ئارام ببوە چاوی بڕیە ڤیری سەرشەقامەکە وبەتینی گەرمی سەرتای ڕۆژ تەرای سەرشەقامەکە کەم کەم دەبوون بەهەڵم بەرەوقوڵای ئاسمان دەکشا .

ئەندیشەی تێکەڵاوی هەڵەکە کرد و چاوی لەتەك هەڵمەکەدا. بەرەوئاسمان کشا .

لەبۆشای ئاسماندا هەزراها پرسیاری لی وورۆژا.

هیچ وەڵامێکشی نەبوو.

دەنگی گرِی مەکینەی پاسەکە بەئاگای هانیەوە.

پاسێکی کۆن . چەند پەنجەرەیەکی شکاو لەتاو سەرما وباران بەفاییەر گیرابوون.نیو پاسەکە سارد وبەرگی کورسیەکانی دڕاو چڵکن لەنێو دانیشتوانی پاسەکەدا چەند پیرژن و پیرەپیاوێکی دیهاتی خۆیان لەبەرگی ئەستوری ترسە سەرما پێچابووە .

لە کوشنەکانی پشتەوە کچ و کوڕێکی لاو دەستیان لە ملی یەکتری ئاڵاندبووجانتایەکی قەبەشیان لەبەرپێکانیان دانابوو تێگەیشت ئەوانیش بەروە شار دەروون.

پاسەکە دەرۆیشت ودانیشتوانی بێدەنگ هەموو چاوەکان چاویان لەچاوی چامی پیشەوەی پاسەکە نەدەتوروکان .بیدەنگیەکان کۆمەڵی هیوای بیدەنگی دانیشتوانی پاسەکەبوون لەنێو ڕووناکی چامی پاسەکەدا تێکەڵاوی کاتی تیپەربوونی شەقامە پرچاڵ و تاسەکەدەبوون.

بەگەرمی جەستەی کۆشنەکەی کەمێك گەرمداهات.هەردوو باڵی لەخۆی ئاڵاندبوو ملی لەنێو ملپیچە توکنە ئەستورکەیدا نواندبوو..ئاوڕی لە کوشنەکەی دواوە بۆ کوڕوکچەکەدایەوە . کچەکە

سەری خستبوە سەر سنگی گەرمی کوڕەکە وکوڕەکەش ئامێزی گەرمی بۆ کردبوە پیخەفێکی سەفەری.

کچەکە لەنەرمە خەویکی نیو ئامیزی کوڕەکە لەنجەی پاسەکە وەك بیشکەیەك دەیلاوان. ویستی ئاشنایەتیەکان لەتەکدا دروستبکات؟ حەزی نەکرد کیژەکە لەخەوی ئامیزی هاوریکەی بترازینی .کوڕەکەش وەك ترسی لەئاینده وچاوەڕوانی بێت چاوەکانی بەشەپۆل ووشە پڕ پرسیارەکانی بەنیو بۆشای پاس وسنکی ڕووناکی چامەکانی پەرشدەکرد. خۆیندنەوەیەکی پیسۆلۆگی بۆ چاوەکان کرد تێگەیشت ئەو دووانەش دوو سەربازی هەڵهاتووی سوپای بیکاری شار ودیهاتە برسی وبیکارەکانی روسیان وئەودالی کاروئایندوژیانی نۆین .

بەبیرکردنەو سەیکردنی رێگاوە کاتەکانی بەرەوتی باسەکە دەرویشت. دەنگی ناسکە ماچێك و چەند ووشەی ڕستەیەکی خەواڵووی بیست ئاوڕی لەکچ وکوڕەکە دایەوە نامەیەکی زەردەخەنە ئامێزی کردە پردێکی باریکی سەرتای بۆ ئاشنابوون لەتەکیاندا. ووتی :

- بەرەو کۆی دەروون ؟

- بۆ سان پیترسبۆرگ .

وەك ترسی لەتەنیای شاری سان پیترسبۆرگ بێت.

شوینی دانیشتنەکەی گوڕی وچوە تەنیشتیانەوە بوون بە هاو سەفەریان.

گەیشتنە شارێکی گەورەتر لەدێکەیان کەتەرمینالی پاسەکانی سان پیترسبۆرگ لێبوو .

تەرمیناڵەکەجەمەی دەهات.خەڵکەکەی ماندوو و ترساو هەرپاسیك بهاتەیە شەپۆلی مرۆڤە شپرزەچانتە بەدەستەکان دەوریان دەدا.

پاش نێوەڕۆ کەمێك تاریك گەیشتە شاری سان پیترسبۆژگ.

وەك چاوی کامیرەمانێکی هوشیار بۆگرتنی وێنە سەرنجدارەکانی شار چاوەکانی بۆکۆکردنەوەی وێنە ئالۆسکاوەکانی شەقامەکان ئاراستەکردبوو.

شارێك وەك شارە میرووله جمەی لەمرۆڤ دەهات شەقامەکان فرکەفرکی ئۆتۆمۆبیل و خەڵکەکەی زۆر شپرزە.

هەر چانتا بەدەستێك ویڵی ئامانجیك بوو .هەندی کەس لەچاوەڕوانی هاوریەکانیاندا بوو.

بەبینین وشادبوون بەیەك یەکتریان لەئامیزدەگرت.

ئەننا بەتەنیا لە تەرمیناڵەکەمایەوە. لەکابینەی تەلەفوونێکەوە تەلەفوونێکی بۆ ناتاشاکرد.

ناتاشا زۆردڵخۆش بوولەبەرئەوەی لەسەرکاربوو داوای لێبوردنی لێکرد ناتوانی کاربەجێبهێلیت وپێشوازی لێبکات ناونیشانی شۆینی کارەکەی پێدا پێگوت بەتەکسییەك وەرە کەگەیشتی من پارەی تەکسیەکەت دەدەم .

یەکەمجاربوو لەوەها شاریکیدا بێت لەژیانیدا ئەوشارەی لا گەورەبوو کەتێدا خویندبووی ژمارەی وتۆمۆبیلەکان شەقامەکانیان تەسك کردبووە. تەکسیەکە بە ڕۆیشتنێکی زۆرخاو دەبوایە بڕۆشتایە.ڕۆحی

چاوەڕوانی ئەنناش دەویست بەهەنگاوێك بەناتاشا وهەواڵی ئەلکسەندەرشاد بێت.

هێزی خەمی دەروونی چاوەڕوانی لاقەکانی دەلەرزان و پەنجەکانی پشتی یەکتریان دەشیلا .

گەیشتە بەردەم ڕەستورانێکی مۆدیرن دوو پیاوی کەڵەگەتی بەرگ ڕەش لەبەرقاپیەکیدا وەك پەیکەرێکی گۆشتن وەستابوون.

نەننا جەستەیەکی ماندوگەدەیەکی برسی رۆحێکی ویلّ پاڵتۆیەکی کۆن ملپیچێکی تووکن جانتایەکی قورس وقژێکی ئاڵۆسکا وێنەی کیژێکی گوندنیشینی داماو وماندووی ڕێگەیەکی دووربوو.

بەزمانێکی تکاوییەوە لەتەك پیاویکیاندا دووا ووتی کە من هاورێ ناتاشام ولە رێگەیەکی دوورەوە هاتووم.

یەکێ لەپیاوەکان چووە ژوورەوە ناتاشای لەتەك خۆیداهانیە دەرەوە ئەنناوناتاشا باوشێکی گەرمیان بەیەکداکردوناتاشا پارەی تەکسییەکەی داوچونەنێو ڕستورانەکەوە.

کاتی نانخواردن نەبوو بۆیە میوانی کەم بوو .هۆڵێکی گەورەی پڕ لەمێز وبەگلۆپی کزسەر مێزەکان ڕووناککرابوونەوە لەهەر سوچێکی ڕستورانەکەدا پیاوێکی بەرگ ڕەش وەك پەیکەر وەستابوون .

ناتاشا چووە ئەو دیوبارەکە وئەنناش لەم دیوە بەرامبەر بەیەك دانیشتن و کەوتنە دووان ناتاشا بە ئەسپای بە ئەننای ووت .

- كاتێكی باش گەیشتی هیشتا زووە بۆ نانخواردن ماوەیەكی ترجێگە بەرناكەویت ئێرە یەكێكیە لە ڕەستوڕانە بەناوبانگە گرانەكانی ئەمشارە هەرچی دێتە ئێرە دەوڵەمەندەكانن.

بەدەم قسەكردنەوە چایەكی بۆهانی وسەیرێكی كاتژمێرەكەی دەستیكرد وپیووت:

- تكایە لێم تێبگە ئەم چایە بخۆرەوە ئیستا تەكسییەكت بۆ بانگ دەكەم ئەمەش كلیلیماڵەوەیە .ژمارەی خانوو وشوینژینەكە و قاتی خانوەكەی بۆ نووسی.

- من ئیمشەو تا بەرەبەیان كاردەكەم . ماڵی خۆتە هەموو شتێكی لێیە خۆت بشۆ نان بخۆ كەمێك بخەوە تادێمەوە.تكایە لەماڵ مەیەدەوروە چونكە شەوان ئەمشارە بۆئافرەتی تەنیا زۆرترسناكە.

- بەیانی تەواوی ڕۆژەكە پێكەوەدەبین .

- كاتمان بۆ هەموشتێك دەبێت.

ئەننا لەخەمی پەیداكردنی ئەلكسەندەردا بوو.وەك ترس لە دڵی ناتاشا بڕەوینێتەوە پێوت.

- چۆن ئەلكسەندەر ببینم ؟دەتوانی پەیوەندی پێوەبكەیت ؟ دڵنیام بزانی من گەیشتووم خێرا دەگاتە لام .نابم بەئەرك بەسەر كاتی تۆوە ناتاشا كەناوی ئەلكسەندەری بیست ڕەنگی كەمێك گۆڕا و زمان ودەستەكاتی كەوتنە تەتەڵەكردن , دەوویست بەخێراترین وئاسانترین ڕستە وەڵامێكی درۆی بداتەوە.خۆی سەرگەرمی ڕێكخستنی پەردەخەكانی سەربارەكەكرد وبێ ئەوەی ڕووبكاتە ئەننا .

- ئیستا کاتی ئەوەنیە . ئەلکسەندەر بۆکارێك چووە بۆ شارێکی تر.
- کەی دێتەوە ؟
- نازانم هەرکاتێك بێتەوە پەیوەنیدم پێوە دەکات. وازلەم باسە بهێنە جارێکی ترسەی کاتژمێرەکەی کردشۆفیری تەکسییەکە جانتاکەی ئەنناى هەڵگرت.ناتاشا بە ئەننای ووت
- هەوڵبدە ئارام بی ماڵی خۆتە پارە نەدی بەتەکسییەکە.ئەمە تەکسی ڕستورانەکەیە.ناونیشانەکەشم دەزانی چونکەشەوانەهەرئەم دەمباتەوە بۆ ماڵەوە ...نەترسی.
کەگەیشتە شوینژینەکەی ناتاشا پاڵتۆ و ملپیچ وپێلاوەکانی داکەن چاوێکی بەهۆڵ وژووری نووستن وچیشتخانە وشوێنژینیکەی گێڕا پاك و تەمیزو رێکوپێك .
هەموو پیویستیەکانی ژیانی تێدابوو.وێنەیەکی ناتاشای بەشێوەیەکی زۆر جوان و مۆدیرن لەسەر مێزێکی پچوکی تەختی نووستەکە دانرابوو.جانتاکەی کردەوە بەرگەکانی دەرهانی وگشتی گرمۆلەببوون.
ئارەزوی خۆشتنی کردوخۆی ڕووتکردەوە بەڕووتی بەنێو شوینژینەکەدا گەڕا.دەرگای دۆلابی بەرگەکانی ناتاشای کردوە سەخناخ بوون لەبەرگی نۆی وجوان ومۆدیرن.کەمێك ئیرەی پێبرد وئاوڕێکی بە لای بەرگە چرچ ولۆچەکانی خویدایەوە . لەبەر خۆیەوە ووتی :
- منیش ئێوە لەبەردەکەم .
زەردەخەنەیەك گرتی لە دڵی خۆیدا ووتی
- بەرگی نۆی بیری نۆیت پێنابەخشێ.

چووە گەرماوەکەوە گەرماوێکی پاك مۆمۆیکی نێوەسوتاو بتڵێکی نیوەی شەمپانا و دوو پەرداخ سەرنجی ڕاکێشا.

- پەرداخی دووهەم خاوەنی کێ بێت ؟

چونکە جەستەی ماندووی ڕێگە وسەرمابووبە پلەی گەرمای ئاوی بانەکەحەزێکی زۆری نووستنی لا دروستکرد وجەستەی خاوببوە.لەنێو ئاوەکەدا بیری لەیەکەم ژوانی ئەلکسەندەر دەکردەوە.

- ئیستا لەکۆی بێت؟
- کەی یەکتری دەبینین ؟
- چۆن باوشم پێدادەکات ؟
- ماوەیەکی زۆرە لەیەك دابڕاوین.هەمووشتێکم بۆدابین دەکات.ئێمە هیوامان بەختیاریکردنی یەکتریە.
- ئەوچاپۆکە دڵنیام کارێکی باشی دەستکەوتوە.
- کەی یەکیتری ببین ؟

دەستێکی ترازایەنێو ئاوەکە لەخەوەکەی ڕایچڵەکان ئاوەکە کەمێك ساردببوە.دوشێکی گەرمی کرد.خاولێەکی لەخۆی ئالاندولەسەرچرپاکەوبەسەیرکردنی تەلەفزوینەکەشەوی بەسەر برد.لەماوەی چاوەڕوانیدا هەمیشە دڵی لای ئەلکسەندەربوو.

هوشیاریشی ترسێکی خستبوە دڵیەوە .

- چ لەتەلەفون و چ ئیمرۆ کەهەواڵی ئەلکسەندەرم لە ناتاشا دەپرسی . چاوەکانی ترس و ووشەکانی درۆیی تێدابوون.دەبێ چی ڕوویدابێت؟

- ئەلکسەندەر هاوڕییەکی تری پەیداکردوە منی ویڵکردوە؟

- بۆچی نا ئەمشارە پڕە لەکیژی جوان.
- ئەویش نێرینەیە . ماوەیەکی زۆرە لەکەیەك براوین وبێ سێکسە نێرینە زۆر حەزیان لە سێکسە وەك ئافرەت ئارامیان نیە .ئەمەش تاوان نیە . یاسای بایلۆژی سروشتە .
- بڕواناکەم ئەو کەسێکی هێندە بێ مۆراڵ نیە بە درێژای تەمەنمان یەك درۆی لەتەکدا نەکردووم.ئەوەی ئەوی لای من جوانکردووە ڕەوشتی جوانی بوو. ئەو شەوەش لەبارەکەدا کەمێك وێڵی کردم تەنیا هۆی مەستی بوو.مەستی ڤۆدگا و مەستی ئەمشارە.ئیستا سەرگەرمی کار وسامان کۆکردنەوەیە بۆ ژیانمان ئای کەبیرت دەکەم ئەلکسەندەر گیان . ئیستا لە کۆی بیت؟ گەربتزانیبایە من لێرەم دڵنیام بە فڕینش بۆایە دەهاتیتە لام.

دڵخۆشی خۆی دایەوە .ژیانی ئەم شارەو وەك ژیانی دیکەمان نیە .

تابەرەبەیان چاوەڕێ ناتاشی کرد.بەرەبەیانێك زوو ناتاشای هاتەوە جارێکی تر باوەشیان بەیەکداکرد وزەرفێکی پری لە میوە وقاپی شەمپانیا وکەلوپەلی خواردنی هانیبوو.

بەبۆنەی هاتنی ئەنناوە شەمپانیاکەی هەڵیچری وبەدەم پێکەنین وگێڕانەوەی یادگارەوە دواتنۆکی تەڕای گەرووی شەمپانیاکەیان نۆشی.چەند جارێك ئەننا پرسیاری لە شوێن و ژیانی ئەلکسەندەر دەکرد ناتاشا بە فێڵێك پرسیارەکەی دادەپۆشی ...

بۆبەیانیەکەی لەخەوهەڵسان هەردوکیان لەباوەشی هەستێکی پیروزدا بوون.ناتاشا ئەننای برد بۆ ساڵۆنێك بەجوانترین شێوە قژی بۆ بڕی و

برۆکانی ڕێکخست شێوەی کێژێکی سادەی لادی گۆڕی بەشۆخێکی مۆدیرنی شار وهەندی بەرگی جوانی بۆکڕی.

ئەننا بوو بەکەسێکی ترهەرچەندە ئەم هەڵویستەی ناتاشای لا جوانبوو لێ ئامادە نەبوو ئەو هەموو پارانەبەناتاشا بەهەربدا.

پێووت

- ناتشا ئیمرۆ پارەیەکی زۆرت بۆ هەردکردم تکایە شەرمەزارم مەکە .

ناتاشا بەدەم پێکەنینەوە ووتی

- گۆیشی مەدەرێ هەفتەی داهاتوو زیاتر بەدەم پیاوە مەستەکانەوە پێدەکەنم .

لێتینەگیشت و ووتی :

- لەمشارەدا پێکەنیش بەپارەیە؟

- بۆ پیاوی گەوج .... ئا

- مەبەستت چییە ؟

- هەڵە تێمەگە من کارەکەم وایە شەوانە کەخزمەتی پیاوان دەکەم ئەوانیش لەکاتی دانی نرخی خواردن ومەیاکانیاندا بەخشیشم دەدەنێ بڕوابکە مانگی وا هەیە پارەی بەخشیشەکەم لە مووچەکەم زۆرترە.

سیرگی لە کۆیەوە پەیوەنیدتان چۆنە؟

- هەردوای ماوەیەك ئافرەتێکی تری ناسی منی ویلّکرد منیش ئەوم ویلّکرد .

- هەروا ئاسان ؟

- بێگومان ئەمە یاسای ئەم شارەیە . ئەی بۆنا ؟ ئەگەر ئەو ژیانێکی تری گەرەك بێ ؟ منیش لەدووی ژیانێکی تر دەگەڕێم .

- مەم ترسینە تۆبڵی ئەلکسەندەریش کەسێکی تری پەیداکردبێ؟ منی ویلکردبێ ؟

- نا ئەو کوڕە پارچەیەك لە پاکی بوو...

ئەم ڕستەیە دڵی ئەننای ڕاچڵەکاند ووتی

- پارچەیەك لە پاکی بوو؟

- چی؟

- بۆچی ئەلکسەندەربووە بە ڕابووردوو؟

ناتاشا نەیدەزانی ئەننا زۆر بەسەرنج و زرنگیەوە گوێ لەووشەکانی دەگرێت ئەمجارەش درۆیەکی تەنکی بۆکرد ووتی

- نامەبەستم ئیستا لێرە نیە.

بەوەڵامەکەی دڵخۆش نەبوو تێگەیشت ناتاشا کۆمەڵی نهێنی ئەلکسەندەری لایەو ناوێری یان دەترسی بیدرکینێ .

هەفتەیەك بوو پێکەوە بوون.

ناتاشا هیچ نهێنێکی ئەلکسەندەری نەدرکاند. ئەنناش پرسیارەکانی چاوەڕوان بوون بڕیاری دا سنوری بۆ ناتاشا دابنێ .

پارستنی نیهێنەکە قۆرساییەکی دەروونی لەسەر ناتاشا دانا بوو . مژی جگەرەکانی زۆرترکردبوو بە بێدەنگی لەتەك خۆیدا دەودوا وێڵی دۆزینەوەی سەرەتاووی درکاندی ڕووداوەکەبوو.

بۆخۆدزینەوە لەگفتوگۆکەیان بەبیانوی جگەرەکێشان چووە باڵکۆنەکە.چاوی بڕیبووە پەنجەرەکانی ساختوومانەکانی بەرامبەری وەك لەدووی ووشەی سەرتای چیرۆکی کوشتنەکەی ئەلکسەندەر لەنێو پەنجەرەکاندا حەشاردرابووبێتن.یەکەیەکە پەنجەرەکانی دەژمارد.ڕیزی یەکەمی تەوادەکرد دەچوە ڕیزی دووهەم.

خۆشی نەیدەزانی بۆ ژمارەی پەنجەرکان دەژمێریێ.

هەربیرکی بۆ بهاتەیە دوای مژێ لەجگەرەکەی وبەبادانی دووکەڵەکەی بیرکردنەوەکەی دەگۆڕی.

جگەرەکەی گەیشتەکۆتای وسەرتاویکی بۆ درکاندنی نیهنیەکانی نەدۆزیەوە.

وەك زۆران لەتەك دۆکەڵدابگرێت ...جگەرەیەکی تری داگیرسان .

- ئەم نهێنیە هەرکاتێك بێت دەبێ بێدرکینم.
- ئەو فرمیسکانە هەرکاتێك بێ دەبێ بتکێن.
- ئەوکۆسپە هەرکاتێك بێ دەبێ ئەننا پێبزانی.
- ئەمە چارەنووسەو بۆتە بەشێك لەمێژووی ئەو وکۆتای هیوایەکی پاکی خۆشەویستی دوومرۆڤی شەیدا بەژیان.
- ئەوەندە بتوانم خزمەت وکۆمەکی دەکەم.ئەم هەموو درۆیە شایانی دووهاوڕێ وەك من وئەو نیە تەمەنی قوتابخانە دڵداری و ژیانی دێیەکەمان.ڕاستگۆبم باشترە لەوەی درۆی لەتەکدا بکەم.
- ئاخر درۆکانیشم جوانە دەموێت بزانم چۆن وکەی بیدرکێنم.ئا دەزانم ڕۆژێك دەبێت هەموشتێك ئاشکرابێت.

- وایە کۆستە ولێکەوتوە زووتر درکاندنی زووتر سارێژدەبێت بێدەنگی وشاردنەوەی تاوانیەکەو من لە ئەنناى دەکەم .
- چۆن و کەی پێبڵێم؟ لەچ شوێنێك ؟

بەدەم بیرکردنەوە هێندە مژی لەجگەرەکی دابوو تا گەرمای ئاگری جگەرەکە پەنجەی گەرم نەکرد نەیزانی بیرکردنەوەکانی کۆتای بە تەمەنی جگەرەکەش هانی .

لەتەنیشت ئەنناوە بە بێدەنگی دانیشت لەتەك خۆیدا لەتەتەڵەکردنی پیلانەکەیدابوو.

- دەیبەم بۆ دیسکۆ و کەمێك سەرخۆش بیت زۆر کچێکی شۆخە هاوڕێ و خوشکم نەبوایە ئیرەیم پێدەبرت.دەڵی هۆنەرمەندێکی شێوەکار نەخشەی کێشاوە.ئەم سروشتە چەند جوانە ئەم هەموو جوانانەش دروستدەکات.ئاورێکی بەلای ئاوینەی دۆلابی جلەکانیدا دایەوە سەیرێکی خۆیکرد.
- منیش ناشیرین نیم . ژمارەی ئەو پیاوانە چەند زۆرن شەیدای شەوێکی ڕووت و چەپکە ماچێکی منن ؟
- ئیتر چاوەڕوانی و درۆ کەڵکی نیە.خۆمان سەرخۆشدەکەین دەچین بۆدیسکۆ دڵنیام لەوەی پێاویك شەیدای دەبێت هەر ئەوەندەی یەك ماچی قاچاخی کرد هەرئەوەندەی حەزی ناوگەڵی پێاویکی تر بەناوگەڵی هەڵژی دڵنیام بەبیستنی کوشتنی ئەلکسەندەر زۆر ئازار ناخوات.

زەردەخەنەیەك گرتی ووتی

- ناتاشا بەشی خۆت زێرەکی ئەمە باشترین چارەسەر.

هەڵویستەیەکی کرد و ووتی

- نا بڕواناکەم ئەننا ڕێگە بەهیچ پیاوێك بدا نەك ناوگەڵی لینجاوبلکات ڕیگەی ماچێکشی نادا.ئەو وێنەی ئافرەتێکی ڕەسەنی بەوەفای ڕوسە.ژیانی بۆ ئەو کەسە تەرخانکردوە کە بەڵێنی هاوسەری پێداوە .

- ئەی چی بکەم خوایە ؟

- هیچ

- سەرخۆشیی باشترین ڕێگەیە.

سبەینێ کۆتای هەفتەیە. لەڕەستورانەکە بەزم گەرمە.

ناتاشا لەم گفتوگۆ بێدەنگیەی نێو خودی خۆی بوو. لەنێوان ناتاشا و ئەننادا ووشەیەك نەبوو.ئەننا هەستێکیرد ناتاشا لە تەك کێشەیەکدا ئاڵۆسکاوە.چارەسەی بۆ دەستگیرنابی .

بەزەردەخەنەیەکەوە شانی ڕاچڵەکان .

- ئەوچیتە لەکۆێت ؟ باڵت هەبوای دەگیشتیتە نێوەی ئاسمان بۆکۆی فرپیبووی ؟ تەنیا جەستەت لێرەیە رۆحت باڵیگرتووە. ناشێت بیر لە سیرگی بکەیتەوە. بەڕاست گەنجێکی باش بوو بۆ ئەو بێوەفاییە پێکردی.

ناتاشا دەیزانی ئەننا زیرەکە نەیورا سەیری چاوی بکات بەسەرداخستنەوە ووتی

- بیرلەژیانی خۆم دەکەمەوە.ئەم ژیانە ولەم شارەدا تەمەن دەسوتینیٚ لەو رۆژەوەی لەتەك ئەودا داپچراوم چاوەڕی شەیدایەکی ترم .

بەسۆزەوە باوەشی بەناتاشا کرد ..پێووت

- ناتاشا ئەوە تاوانی تۆ نەبوو ئەگەر ئەوبیر لەتۆنەکاتەوە تۆش چی دەکەیت؟ دڵنیام شۆخییەکەت هێندە جی سەرنجە هەموو پیاویك بەهاوڕێتیت دڵشاد دەبێت.ژیان وایە هێڵیکی راست نیە شەقامێکی قیرتاوکراو نیە(بەپێکەنینەوە)ژیان وەك تاقە شەقامە پرچاڵەکانی دێیکەی خۆمانە.هەموی چاڵ وکۆسپە.

- چەندەها شەیدا بەیەك نەگەیشتوون.کۆتایش بەچیرۆکەکانیش ناهاتووە.مرۆڤ میژوو دروستدەکات نەك میژوو مرۆڤ.

- ئازا ئەوکەسەیە چۆك بەرامبەر بە کۆسپەکان نەدا.

سەیرێکی چاوەکانی ئەننای کرد.هەستیکیردپیویستە بەزووترین کات نهێنی کوشتنی ئەلکسەندەری پێبلیٚ :

ووتی

- ئەم ووشانەت بۆنی قسە جوانەکانی دایکتیی لێدیٚ؟

- پێش هاتنم دایکم کۆمەڵی ئەگەری ئەم شارەی خستە سەر شانووی ڕووداوەکانی ژیانم بەهێزیکردم ئازابم بەرامبەر بە ئازار بە کۆسپ ئاگاداری ئەوەی دامی ئەم شارە دەریایەکە پڕە لە نەهەنگی برسی گۆشتی جەستەی ئافرەت.دایکم مامۆستا و هاوڕێ و ڕابەرمە.

- راستدەکەیت.

- ئامۆژگارییەکانی دایکم پڕیتی لەزانستی سۆسۆلۆگی ولۆگیك.دایکم زۆر زیرەکە ووتی(ژیانی مرۆڤ لەنێوان ڕابوردو ئایندەدایە) لەڕابوردوو مەترسە بائیندەت جوان بێ .ژیانی مرۆڤ وەك تابلۆویەکە گەر بەیەك ڕەنگ بکیشرێ تابلۆیەکی ناشیرینە.ئەوە ڕەنگە جوداکانی ژیانە تابلۆی ژیان جوان دەکات).

- یانی کۆسپ وئازار وگرفتەکانی ژیان نابێ مرۆڤ بترسینێ.گرنگ کۆڵنەدانە بەرامبەربە کۆسپی ژیان لەپێناوی ئایندەیەکی جواندا.

ناتاشا کەئەم بڕوایەی ئەنناى بیست دڵنیابوو بەبیستنی کارەساتی کوشتنی ئەلکسەندەر .چۆکدانادا .

پێکەنی دڵخۆشم بە ئازایەتی و بڕوا و هوشیاریت .

- منیش حەزدەکەم ئەوکارەساتە لەبیربکەم.

- بوونی تۆش زۆردڵخۆشیکردم .

وەك هەستی هاوریەتی خۆی نیشان بدا دەستێکی خستە دەستیەوە بە توونەدی گۆشی پیووت

- ناتاشا بەژیان لێت جیانابمەوە من نە برا و نەخوشکم هەیە تۆ هەردووکیانی بۆ من براو خوشکی

ناتاشاش هەمان شێوە دەستی گوشی و باوەشێکی خۆشیان بەیکدا کرد ناتاشا ووتی:

- سبەیشەو کۆتای هەفتەیە کوتای هەفتان لەو ڕەستۆرانەی کاریتێدا دەکەم.سەما گەرمە ئەوانەشی دێن کەسانی هەرزەکار و سەرسەری نین , هەندی خێزانیش بۆ بەسەربردنی شەوێکی خۆش دین بۆ

***ئەوی.دەڵێی چی سبەی شەوەپێکەوە شەوێکی خۆش بەسەربەرین ؟ نەپارەی چوونە ژوورەو نەخواردن و خواردنەوە نادەین ؟***

***ئەننا ویستی قسەیەك بکات قسەکەی خواردەوە ناتاشا زانی ئەننا گەرێکیتی جارێکی ترپرسیاری ئەلکسەندەری لێبکات.هەردووکیان لەمەبەستی چاوی یەکتری گەیشیتن ئەننا پرسیاری نەکرد چونکە هەستیکرد ئەگەر پرسیارلە ئەلکسەندەربکات.زامی دابڕانی ناتاشا و سیرگی دەکولێتەوە پرسیارەکەی قوتدایەوە .***

***ڕەزامەندی خۆی بۆشەوێکی مەستی و پڕسەما .***

***بەچاوەکانی نیشاندا.***

***کۆتایی هەفتەیە .***

***ناتاشا هەموو جل وبەرگەکانی خستبووە سەرتەختی نووستنەکە هەریەکەیان بەرگێکی تاقیدەکردەوە بە ئەننای ووت :***

***- کۆام بەرگەت بەدڵە لەبەری بکە بۆمن گرنگ نیەچونکە هەموویانم تاقیکردۆتەوە.***

***لەئەنجامدا ناتاشا ئەننای بەجوانترین شێوە وبەرگ ڕازاندەوە کراسێکی ڕەشی تەنکی گرانبەها وجانتایەکی پچوك و مووەکانی سەری بە شێوەیەکی سێکسی ڕێکخست و لێوەکانی بە ڕەنگێکی توخ پشتی چاوە شینەکانی کەمێك تاریك کرد.درزی سنگی کراسەکەی زۆر ئاواڵەبوو ئەننا بێ پەسەند نەبوو پیاوانی بێگانە هەڵاوی درزی مەمکەکانی هەڵژن.ویستی دەرزییەکی لێبدا ناتاشا دایە قاقای پێکەنین ووتی:***

- ئەوە چیدەکەی دەزانی ئەو کراسە چەندگران ومۆدیرنە؟
- ئەو دەرزییە لە سنگت بدەی دەبیتە جێ پێکەنینی پیاوان .ئێمە ناچین بۆ کەنیسە.ئەو کەسەی ئەوکراسەی دروستکردوە بەمەبەستی نیشاندانی سنگی ئافرەتە.
- دەچین بۆسەما وشەوێکی ڕۆمانسی.شیتکردنی پیاوانی چلیس.
- چیمان هەیە لەچەکی جوانی زیاتر بۆ چەککردن وچۆکدادانی درندەی پیاو ؟
- سەیرکە هەموو سنگم ڕووتە تەنیا گۆپکەکانی شارەوەن .ئەلکسەندەر وا بمبینی نامناسیتەوە
- کاشکێ منیش سنگ ومەمکێکی وەکی تۆی پڕشەهوەت وجوان وسیکسیم هەبوایە.لەتۆ زیاتر ڕوتم دەکرد.پیاوانم پێچەك دەکرد.
- ئیستا کاتی ئەوەنیە کاتمان کەم وجوانترین بەرگە ودڵنیابە ئیمشە تۆ جوانترین ئافرەتی ڕستورانەکە دەبیت.

ئەننا ئامادەی خۆی دەربڕی وبەتەکسیە چوون بۆ ڕستورانەکە.

ناتاشا دەیزانی کەی کاتی هاتنی میوانەکانە.

پێش ئەوەی پچنە هۆڵی ڕستورانەکە لەتەوالیتەکە بۆنێکی زۆرسێکسی لەجانتاکەدەرهانی و نەك سنگی ئەننا بەڵکۆ سەرجەم جەستەی لەبوون هەڵکیشا.

ئەننا دەستی کرد بە پێکەنین ...

- وریابە بەشی خۆتی تێدا بمێنیتەوە.

***لەهەر سوجبێکی ڕستوراِنەکەدا پیاوێکی کەڵەگەتی کەتە بەقاتێکی ڕەش و بۆینباخ وەستابوون.دانیشتوانی ڕستورانەکەی سەرگەرمی خواردن وخواردنەوە بوون.موسیقایەکی هێمن سەرپۆشێکی تەنکی دابوو بەسەر رۆحی دانیشتوانەکەدا ژمارەی پیاوانی بێ ئافرەت کەم .ژمارەی ئافرەتانی بێ پیاو زۆربوون.جوانی ورێکپۆشی بەرگەکەی ئەننا سەرنجی دانیشتوانی ڕستورانەکەبوو .یەکەمجار بوو لە ژیانیدا بەم شێوە شۆخ و جوانیەوە لەوەها شوێنیکدا بێ.تەریقیەکی ناسك بووبە زەردەخەنەو قۆڵی ناتاشای ڕاکیشا و بەئەسپای ووتی:***

- ***هەموو سەیرمان دەکەن.***

***ناتاشا ووتی***

- ***نا هەموو سەیرتدەکەن. پێمنەگووتی تۆ دەبێت بە جوانترین ئافرەتی ئەم ڕستورانە .***

***پاش کەمێك ڕەوتی موسیقاکە گۆڕدراو بە بەزمی دانس هەریەکە لەتەك هاوڕێکەیدا کەوتنە سەما.چەند پیاوێکی چلیسی تەنیا بەمەبەستی ڕێگەخۆشکردن بۆ سەما لەدوورەوە پێکەکانیان بۆ ئەننا ونەتاشا بەرزدەکردەوە.***

***ئەننا شەرم وئەمەکی بۆ ئەلکسەندەر وەك قۆزاغەیەکی دڕکین جەستەی داپۆشی بوو.بۆیە وەڵامی پێکی هیچ پیاوێکی نەدایەوە.***

***لەناکاو جوڵەیەکی نائاسی لەنێو پیاوە بەرگ ڕەشەکان پەیدابوو لە جێگەی خۆیانەوە وەك ئامادەی ئەمرێك بن خۆیان قیتکردەوە.پیاوێك بەجوانترین بەرگ خۆیگۆڕی بوو چەند***

کەسێکی قەبەی پووختپۆش بەدوایەوە بون هاتە نێو هوڵی ڕستورانەکە .
ناتاشا بە ئەننای ووت :
- ئەو پیاوە خاوەنی ئەم ڕستورانەو نێوەی ئەمشارە هی ئەوە.
ئەننا ووتی
- ئەی ئەو پیاوانە چیدەکەن لەدەوری ؟
- گشتیان پارێزەریگای دەکەن
- لەودەچی پیاویکی زۆر ترسناك بێ ؟
- ترسناکە و زۆر دەوڵەمەندیشە .
- گەنجیشە ئەم هەموو سامانەی لەکۆێوە هانیوە؟
ناتاشا بەچرپە ووتی
- بێدەنگبە دوای هەموو شتێکیت پێدەڵیم .
هەرئەوەندەی نزیك مێزك بووە خێرا یەکی لەپیاوەکانی کورسیەکی بۆهانیە پێشەوە خزمەتگوزارەکان مێزەکەیان زۆربەجوانی بۆ ڕازاندەوە.بەخێرای پێکی یەکەمی ویسکێکەی نۆشی.
پیاویك لەپیاوەکانی پەرداخێکی نۆی پیکی تیری بۆدانا .
موسیقا و ئەدمۆسفیری ڕستوۆڕانەکە ڕۆحی هەموو دانیشتوانی خستبوە زەردەخەنە و سەماوە. پیاوە سەڵتەکان وێڵی پەیداکردنی قاشێکی نەرمی باوەشیان بوون.خانمانی شۆخیش ڕۆژی نازفرۆشتن وکەشخەوبازی بازیی پیاوان بوون.دوای پێکی دووهەم پیاوەکە کەوتە

***چاوگێڕان بەنێو هۆڵەکەدا جوانترین دیمەنی هۆڵەکە ئەننا وناتاشا بوون.ناتاشای وەك كارمەندی رەستۆڕانەکە دەناسی.***

***بەیەکی لەپیاوەکانی ووت ناتاشا و هاوریکەی بهێنێتە سەرمیزەکەی پیاوەکەی بە گوی ناتاشای چپان .***

***.ناتاشا لەترساندا زەردهەڵگەڕا و دەیزانی بانگردنەکەی لەبەر جوانییەکەی ئەننایە.***

***بۆیە قۆڵیکرد بەقۆڵی ئەننا ویستی لەتەك خویدا بیبات.***

***ئەننا هەڵویستەیەکی کرد .ناتاشا چرپانی بە گویدا.***

***- پێمووتی ئەو پیاوە خاوەنی ئەم ڕستورانە و نێوەی ئەم شارەیە من چەند کاتە لێرە کاردەکەم تائیستا سڵاوێکی لێنەکردوم ئیستا لەبەر جوانێکەی تۆیە بانگم دەکات چار نیە دەبێ بچین.***

***ئەننا ووتی***

***- تۆ بەتەنیا بچوو***

***ناتاشا بەترسەوە ووتی ئەمە نەگبەتیە و توشمان هات. چی بوو لێمان پەیدابوو زۆرکەم بێزدێ بێت بۆئێرە.بابڕۆین بڕوابکە ئەگەر نەچین بەزۆر دمانبەنە سەرمێزەکەی بە چاو ئاماژەیەکی بۆ پیاوە پاسەوانەکانی ڕستورانەکەرد ووتی:***

***- بڕوانە ئەو پیاوانە لە سووچەکاندا وەستاون وئەوانەی لەپشتیەوە گشتی پیاوی ئەون .***

ئەننا بەگۆیی ناتاشای کردوو بەرە و مێزەکە ڕویشتن پێش گەیشتنیان دووان لەپیاوەکانی پشتی ملی دوو کورسیان گرت بۆ ئەننا وناتاشا ئامادەکرد.پیاوەکە کەوتە نێوانیانەوە.

ڕویکردە ناتاشا پیووت.

- ئەم شۆخە ناسکە خوشکتە ؟
- (بەترسەوە) نەخێر وەکی خوشکم وایە هاوڕی تەمەنمە.

پیاوەکە ڕویکردە ئەننا

- پێخۆشحاڵم بەناسینت

دەستی تەوقەی بۆدریژکرد و چاوەزیتە پرشەهوەتەکەی برپە قوڵای هیمنی چاوە شینەکانی ئەنناوە.

یەکەمجاربوو ئەننا لەوەها ئەدمۆسفیرێکی گرژدا بژی لەشەرماندا چاوەکانی داخست .

مێزەکەیان بەشێوەی مێزی پاشایەك ڕازاندەوە. تادرەنگ بوایە موسیقاکەش بەحۆچشتر دەبوو.پیاویك لەتەنیشتیانەوە وەستابوو تەنیا ئەرکی گۆڕین و پڕکردنی پەرداخ بوو.ئەننا لە سەرەتادا خۆی لەخواردنەوە ویسکی پاراست.

چونکە خوێنی پاکی جەستەی ڕەنگینی ئاشنای ئەلکحول نەببوو دوای خۆاردنەوەی پێکی یەکەم هەستی بەسەر ئیشەو مەستیەکی کەمکرد هوشیاریی جلەوی حەزی ڕاگرت گشت پێکەکانی وەلادەنا کەپیشکەشیاندەکرد.

کەزانی بۆی سەرخۆشناکرێت بێشەرمانە لەژێر مێزەکەوە دەستێکی خستە سەررانی و ویستی بیترازینیتە نێوگەڵیەوە .

چاوەکانی مۆنکرودەستی کابرای لە نیوگەڵیا بە توڕەیەوە لابرد.

بەم هەڵویستە کابرای زۆرتوڕەکرد.

بەئاماژە بۆپیاوەکانی وەهەستایە سەرپێ ومێزەکەی بەجێهیشت دوو پیاو یەکی باڵی ئەننا و ناتاشی یان گرت و بێ ئەوەی پرسیاریان پێبکەن لەتەك خوێاندا بردیانن .

خۆی ڕاپسکاندن و ویستی دەستی پیاوەکە لەقوڵی بترازینی لێ بەشێوەك گرتبووی هیچ شانسێکی نەبوو.لەبەر ڕستورانەکەدا دوومارسیدسی مۆدیرن ڕەش و پەنجەر داخراو وەستابوون پیاوێك دەرگاکەی بۆکردنەوە خاوەن ڕستورانەکە چووە دوواو بەزۆر ئەننایان خستەپاڵ .ئەننا ئاوڕێکی لەناتاشا دایەوە هاورێکی لێکرد وناتاشایان خستە ئۆتۆمۆبیلیکی ترەوە.

دورکەوتنە لەنێوو ئۆتۆموبیلەکەدا بەتوڕەیەوە لەتەك کابرادا دەدوا کابراش وەك گاڵتەی بە قسەکانی بێت دەمی پڕدەکرد لە دوکەڵ و دەیکرد بەرووی دا.

لەشار دورکەوتنەوە.

لەبەر ڤیلایەکی گەورەد ائۆتۆمۆبیلەکان خاوبوونەوە تا بەشێنەی دەگاری کارەبایەکە کرایەوە .

ئەننای ونەتاشایان پەلکێشی نێو ڤیلاکە کرد.

هۆڵێکی ڕووناکی ڕازاوە بەجوانترین دیکور وپەیکەر وتابلۆی گرانبەها وئینجانەی گوڵ بەپلیکانەیەکی مەمەردا سەریان خستن و هەریەکەیانیان لە دوو ژووری جودادا فڕیدا.

لەژوورەکەی ئەنەنادا تەختی نووستنێکی ئاوریشمی چنراو.گڵۆپێکی کز وبتڵی ویسکی وچەندچەپکە گوڵێکی جوان ڕووی پەنجەرەکان بەجوانترین ورێکوپێکترین پەردە و دیکور ڕازابوونەوە.

دەرگایان لەسەرئەننا داخست.

هەموو جەستەی پشکۆیەکی تورەو پەشیمانی وترس بوو.بەناو ژوورەکەدا ئەم سەر و ئەوسەری کرد لەپەنجەرەکەوە ڕوانیە باخچەکە وویستی خۆی فڕێبداتە خوارەوە.

ترسی بەرزی باڵەخانەکە رایچڵەکان.

لەدۆزێکی دەروونی سەختدا بوو بەشێ لە بیرکردنەوەشی لای ناتاشای بوو.دەنگی قیژەی ناتاشا ڕایچڵەکان و قیژەکانی بوونە هاوار. بەنیازی یارمەتی پەلاماری دەستکی دەرگاکیدا دارخرابوودا.

گوینا بە دەرگاکەو زیاتر هاوار و گریان وقیژەی ناتاشای دەبیست و ئازار دەچێژا ولەتاواندا کەوتە قیژاندن ولێدانی بۆکس و شەق لەدەرگاکە.

دەستکی دەرگاکە جولاو لەدەرگاکە دورکەوتەوە لەکاتی کردنەوەی دەرگاکەدا دەنگی قیژەوهاواری ناتاشای زیاتر بیست خاوەن ڕەستۆرانەکە ڕۆبێکی بەڕووتی کردبووە بەریی.

بەکردنەوەی دەرگاکە ویستی پاڵ بە کابراوە بینی و رابکاتە دەرێ بەهاواری ناتاشا بگات.

دەستی خستە گەردنیەوە و پشتاو پشت بەتونیدی وتوڕەبوونەوە نزیك پێخەفەکەی کردەوە.تا توانای هەبوو زللەیەکی توندی لە ڕوومەتی داو و ئەننای تاسان و فرێدایە سەر پێخەفەکە.

ڕۆبەکەی لەداماڵی .

ئەننا بە پاڵکەوتنەوە وپیاوەکە بە پێوە ناوگەڵی ئەستووربوو. ئەننا تێگەیشت ئاژەڵێکەو فیێ سیکس گرتوویتی و هیچ بۆاریکی نیە تەنیا لە چاوەڕانی حەزە دەورونیە پیسەکان زیاتر.

چاوەکانی فرمێسکی ترس بەزیی تکاپاڕانەوە گشتی ووشەی بێدەنگ بوون, ئەو لێتێنە گیشت. بەڕووتی خوێدا بە سەر جەستەیدا .

خۆی ڕابسکان لێ جەستەیەکی باریك وناسك و خونچەیەکی پاك لەبەر هێرشی جەستەیەکی دڕندە و پیاوێکی بەهێز توانای بەرنگاربوونەوەی نەبوو .

دەستێکی خستبوە سەرسنگی و بەدەستەکەی تری دەرپێیەکەی دڕاندە لاقەکانی بەزۆر بەرزکردەوە .

پەنجەکانی بەشێوەیەك لە قورگی گیرکربوو هەر ئەوەندە مۆڵەتی کەمێك هەناسەبدا و ونەمرێت وەك بەنجکراوێك لەبەرحەزی توڕەی پیاوەکەدا بێ جووڵە کەوتوبوو لەئازاری جەستە وناوگەڵ وزللەو ویژدان ورۆح و نەگبەتی .

چاوەکانی بوون بە دوو تۆپەڵ فرمیسك و ڕژانە سەرسەرینە سپیکە و ماسکارا و فرمیسك بوون بەرەنگێکی تۆخ تابلویەکی پڕتاوانیان لەسەر ڕووی سپی سەرینەکە بۆ میژوویی ئەو ژوورە نووسیەوە .

هێندە تینوی جوانیەکەی بوو وەك پەرییەکی لە ئاسمانەوە بۆی هاتبیتە ژووری نووستنەکەی ترسی فڕینی هەبێ باڵەکانی لەبالای باریك وناسکی ئەننا گیرکردبوو.

شیتانە تەکانی لەجەستەی دەدا.تەکانەکانی نەك حەزی بەجەستە و ڕوحی ئەننا نەدەگەیاند هەموو تەکانێکی چەقۆیەکی سورەوکراوبوو جەستە و ڕۆحی داخدەکرد.

چەشنی فیلیهاتوویەك نرکەنرکی دەروون وهەناسە برکێ تا دوا تنۆکی زۆخاوی شەهوەتی نەتکانە نێوگەڵیەوە باڵەکانی لەبالای ناسك وباریکی ئەننا شل نەبوونەوە.

هەناسەکانی ئارام بوونەوە باڵەکانی شکردەوە بە سەر ئەننادا تلیسایەوە.

تلێکی داو لەسەرجەستەی ئەننا خۆیترازانە تەنیشتیەوە.

تەنیا هەناسەی ساردی دوای تەکانە گەرمەکان دەدا.

وەك نێچێرێکی زامداری کەمێك زیندو زۆرێك مردوو بەئاستەم هەناسەکانی نەرمای نەرمۆڵەکانی مەمکی بەرز و نزم دەکردەوە , دەنگی هەناسەکانی ئاوزازێکی غەمباربوون فرمێسەکانی چاوی لەمانایان دەگەیشتن.

ژمارەی فرمێسکەکانی زیادی کرد و ڕێچکەیان لەسەر ڕوومەتەکانی گرت.هەرفرمێسێکی ووشەیەکی ئامۆژگاریەکانی دایکی بوو پێش ئەوەی ئەم ڕووداوە ڕوودابدا دایکی ووتی:

- کچم شار پڕیتی لەنەهەنگی برسی.تۆش ماسیەکی خرپن و مەمك خرٍ وگۆشت شیرینی .
- وریابە کچم وریابە.
- کچم وریابە.

پیاوەکە لەپێخەفەکە دورکەوتەوە.دەنگی قێژە و لێدانی ناتاشا جارێکی تربەرزبووە.لەتاوقیژەکانی ناتاشا ئازارەکانی خۆی لە بیرچووە.بەنیازی کۆمەکردن بەناتاشای هاورێی لەسەر پیخەفەکە ڕاپەری وبەچاوی پڕ فرمێسك وناوگەڵی تەڕەوە بەرەو دەرگاکە ڕاێکرد پێاوەکە لەدواوە پرچەکانی ڕاکیشاو پاڵێکی پێوەنا بەدەمدا بەسەر پێخەفەکدا خستی.

لە ژوورەکە چووە دەرەوە . دەرگاکەی لەسەر ئەننا داخست.

لەترسنا جووڵەی لەخۆی برپیبوو. ترسی ئەوەی لێنیشت ناتاشایان کوشتبێ .کەمێکی تریش ئەم دەکوژن و بەدیداری ئەلکسەندەر شاد نابێت .

بێدەنگیەکی ترسناك ئامێزی بە ڤیلاکەدا کردبوو.

نەخشپەی پێیەك.

نەچرپەیەك . نەسرپەی مرۆڤێك گیانداریك نەدەنگی سەگێك نەدەبیسترا.

لەترساندا نەیدەویرا ئاورٍ بۆهیچ سوجێکی ژوورکە بداتەوە.

هەموو گوڵە جوانەکان لەبارچاوی ئەو ڕەشیان دەنواند. گشت تابلۆ بەنرخەکانی ژوورەکە مۆرە وهەرەشەی ترسیان لێدەکرد .پەردەکانی لێبوو بە باوشێ گوریسی هەڵواسرا وئامادە بۆهەڵواسینی مرۆڤەکان.

دەگریا وخۆشی دەنگی خۆی نەدەبیست.وەك سەرتاپای جەستەی بەنجکرابووبێتن هیچ ئەندامێکی جەستەی بۆ نەدەجوڵا .

ئاوێنەکی چوارچێوە ئاڵتوونی باڵابەرز لەدوورەوە بەزیی بە داماوییەکەی ئەننادا هاتەوە ڕووناکی ڕوومەتی ئاوینەکە بانگی ئەننایان کرد

ئاوێنەکە ووتی:

- وەرە لە ڕووناکی ڕوومەتی منەوە کەساسی خۆت ببینەو لەم دونیا ئاژەڵییە بگە.

چۆن مرۆڤێك لەتەنیایدا بۆ ڕازی دەروون بەبادانی نەگبەتیەکانی ژیانی دەچێتە سەر ڕووبارێك لەتەك تەوژم و ڕەوتی ئاوی ڕووبارەکەدا دێتەگووتن.ویستی بچێتە بەر ئاوینەکە و سکاڵای ئازارەکانی رۆح وجەستەی بۆ بگێڕایتەوە.

وەك لە ئاوینەکە بترسێ بە هەنگاوی ترساوی لێنزیك کەوتەوە .

کەخۆی بینی لەچێاتی گریان قورسکەیەکی تاساو لەگەرویدا تاسا.

سەرو قژ ئاڵۆسکا.سنگی کراسەکەی تاسەر ناوکی دادڕابوو ,گۆپکەکانی مەمکی فرمێسکی تورەبوونی مژینی دەمی پیاوێکی نامۆیان دەرشت .

لەسەر ڕەنگی پەیمەی سنگ ومەمکەکانی جێگای مژین و گازە شێتیەکان لەچەند لاوە پەڵەی سۆری تۆخ وکەمێك شینیان

کردبوو.چێ پەنجەی دەستی زللەکە بەسەررووومەتەوە سوری توخیان تیزابوو .پەمەی پیست وماسکاری ڕەشی چاوەکانی وسووراوی شێواوی لێوەکانی لەسەر ڕووی تابلۆیەکیان کێشابوو.

تەنیا هونەرمەندێکی شێوەکار لەمانای تێدەگەیشت.

پێش چەند کاتژمێری ئاوینەکەی ماڵی ناتاشا ووتی :

- ئەننا تکایە لەبەر دیدەی تینوی مندا بۆساتێك بمێنەرەوە تا منیش تینویتیم لەجوانیکەت بشکێ .

ئاوینە پیرە چاوکزەکەی ژووری خانووەکۆنەکەی ماڵی باوکی هەموو ڕۆژێك لەسەرەتای بەیانیاندا تکای لە ئاننا دەکرد چاوی شینی نیشانبدا تاا شینی ئاسمانی لەیاد نچێ قەدەرێکی زۆرە لەم ژوورەدا زیندانیەوە نەشینی ئاسمان نەچاوی گەشی خۆر بینوە.تەنیا چاوەکانی تۆیە وینەی ئەو دوو وێنە سروشتیەم پێدەبەخشین.

شەوانە تا ئەننا لەبەرچاوی کزی ئاوێنە پیرەکەی ژووری نووستنەکەیدا خۆی ڕووتنەکردایەتەوە ئاوینەکە چاوەکزەکانی وەنەوزی دەدا تا گۆپکە پەمەیەکانی نەبینیایە ئاوێنە پیرەکە نەدەنووست . ئەننا بەم نیهێنەی نەدزانی

ئیستا ئاوێنەکی چۆارچێوە ئاڵتوونی.بە شێوەی خانمێکی ڕۆح وجەستە داتەپیوو دەبینی .سەرگورشتەی ڕۆحی ئاوینەکانی دەستەخوشکی ئاشنا بەجوانی ئەنناى بۆی دەگیرێتەوە.

تەنیا خۆی دەبینی و دەنگی ئاوینەکە نابیستی.

دایکی ووتی :

- کچم ئاوینەش زمانی هەیە و تۆ نایبیستی .

بەدەم هەنسك و گریانەوە بەسەر پیخەفەکە بەدەمداکەوتبوو بەرگەکەی ترازابوون درزی سمتەکانی دەرکەوتبوون .

گوومەزە خرپنەکە ناوگەڵی دیمەنێکی سێکسی جوانی دەنواند .

دەنگی بادانی کلیلی دەرگاکە هات.

لەترساندا چاوەکانی نوقاند.

باوەشیکرد بەسەرینەکەیدا دەویست هێندە پچوکببێتەوە بچێتە نێو سەرینەکە وخۆی لە ترسا حەشاربدا.

پیاوەکە جارێکی تر هاتە ژوورەوە ئەو دیمەن جوانەی ئەنناى لەپشتەوە بینی حەزی گرپگرت.ناوگەڵی گەرمداهات ودەمی رۆبەکەی بەرزکردەوە چرۆکەکەی دەستی فرێدا وقۆمێکی قۆڵی لەپێکە ویسکێکەی دەستی دا.

چاوەکانی بەجوانی پشت وسمت وپەرژی قژی سەرشان وملیدا خشاند ووتی

- خوایە ئەمە ئافرەتە یان پەری کۆشکەکەی تۆیە؟

- وا ئیمشەو رێکەوت کردی بەنیچری ئەم ساتانەی من.ئەم هەموو جوانیە تەنیا لەماڵی خواوە هاتوە کچی خوایە یان ژنی ؟

رۆبەکەی داکەن و بەئەسپای وەك دەست بۆ کەرۆێشکێکی سرك بەرێ لەحیاتی زللە دەستی بەقژە خاوە پرشەکەیدا هانی و چاوەکانی وێنەی

جوانی پشت و سمت  شان و ناوگەڵی ئەننایان دەگویزایەوە بۆ رۆحی شیتی .لەجی گازبەسەری زمانی تەڕای پیستی دەلستەوە .

تامێکی شیتکەری بە رۆحی بەخشی . تێری نەخوارد .

ناوگەڵی ئەستور  و زمانی تینوو . بۆ سڕینەوەی جێ گاز و مژینە شینبووەکان   ویستی بەماچ کاڵیان بکاتەوە . دەمی خستە نێوان سمتەکانیەوە بۆنی نێوگەڵی هەڵمژی  تێری نەخوارد.

زمانی تینویتی نەشکا وەك زمان بخاتە شانە هەنگوینێکی بێ هەنگەوە ترازانیە نێوگەڵیەوە  بۆ میتکەی دەگەرا . بۆی بمژێ تا تەڕای نێوگەڵی ئەننا تینوتی نەشکان.

زمانی مژینی نەتراتزان .

لەژیاندا بۆ ئەننا نەمژرابوو ئارەزوویەکی نووی بەرۆحی گەیاند بیئەوی گەرەکی بێ ناوگەڵی بۆمژین خۆشکرد شیلەی ناوگەڵی زیاتری دەردا. ترازانیە نیوگەڵیەوە بەئارامی لەقولایدا بۆ چەند جاریك سەری زمانی حەزی ئەننای سمی و جەستەی گەیاندە سەرتای رەحەت بوون.ماوەیەکی دریژ.بەمهرەبانی وسۆزەوە لەباوەشی گرتبوو.لەهەموو تەکانیکدا .رۆحی ئەننا ئارام وتوڕەبوونی جەستەی ساردبوونەوە.

لەهەموو بستیکی ژورەکەدا چاوەپرفرمیسك و گلەیەکانی  ئەلکسەندەر بۆ ئەننا دەگریا و ئەنناش دەپاڕایەوە من قوربانیم نەك تاوانبار .

پاش چەپکە تەکانێکی ئارام هەرچی تەڕای جەستەی هەبوو رژانیە نیوگەڵی ئەنناوە .

چۆن کۆتربازێك ترسی فڕینی کۆترێکی خۆشەویستی هەبێ و گەرەکی بێ ماڵیی بکات بە ئارامی باوەشی بە ئەنناداکردبوو دەستی بەشان مل و قژە پرژەکەیدا دەهانی.

باوەشەکەی بۆنی عەشقێکی نامۆی لێدەهات. فرمێسکەکانی ئەننا وشکیانکرد.

ئەننا تێگەیشت ئەمە سیحری خوا و یاسای بایۆلۆژی جەستەی مرۆڤە زۆر دەمێك بوو بێ سێکس و چاوەڕیی ئەلکسەندەر بوو..

هەردووکیان لە تەتەڵەکردنی پرسیارە نویکاندا بون ئەدموسفیریکی نۆی هەردووکیانی بێدەنگکردبوو.

دەنگی قیژە و هاواری ناتاشا ئەو دیمەنەجوانەی لەرۆحی پیاوەکەدا ژاکان .

بەتوڕەی و بەرووتی چووە دەرەوە . دەنگی نەتاشا کپ بوو.

گەڕایەوە سەرپیخەفەکەی.

ئەننا لەترساندا جووڵەی نەدەکرد.کپبوونی دەنگی ناتاشا ترسی کوشتنی پێدا .

پیاوەکە وەك عاشقێك بەئەسپای لەتەنیشتیەوەپاڵکەوت.سەری ئەننای لەسەر قۆڵێکی دانا.ویستی ڕووی ئەننا بەلای خۆیدا وەربگێرپینی . پەسەندی نەکرد ولەپشتەوە لەباوەشی گرت.

ماویەك پیاوەکە رۆح وجەستەی ئارام بوو.لەئاوینەی بنمیچەکەوە دیمەنی جوانی ئەننا وخۆی بینی شەیدای دیمەنەکە بوو.

بەجێهێشت .

لەسەرپێخەفەکە باوەشی بەرانەکانیداکردبوو.

چاوەڕی جێمی سێکسی تربوو.

ژوورێکی بێدەنگ وخامۆش. دەروونێکی سوتاو ئازاری جەستەیەکی بریندا و رۆحێکی سوککراو.

دەرگای ژوورەکەی کرایەوە .

لەترساندا سەری لەنێو ڕانەکانیدا بەرزنەکردەوە وایدەیزانی جاریکی ترکابرایە و دێتە وێزەی جەستە و رۆحی برینداری.

ناتاشا هاتە ژوورەوە چاوی بەئەننا کەوت دایە پرمەی گریان و کە گریانەکەی بیست سەری بەرزکردەوە بەپرتاو هەستایە سەرپێ باوەشیان بەیکتریداکرد.رووی ناتاشای بینی لەچەند لاوە شین بۆتەوە

- چیان لێکردوویت هاوار. ئەننا قیژانی

ناتاشا کە ڕووی ئەننای بینی هاواریکرد ئەوە

- چیان لێکردوویت

بۆیەکتری دەگریان.کەمێکی نەبرد دوو پیاو هاتن وبەبێدەنگی پەلی هەردووکیانیان گرت و لەتەك خۆیاندیان بریدان وسواری مارسدیسیکان کردن.

تاگەیشتنە ناوشار یەك ووشەیان لەتەکدا نەووتن.

لەتاریکی شەقامێکدا مارسیدسەکە وەستاو

ئەننا و ناتاشیان دەبەزاندن.

## گەرووی شەقامەکانی شار

بۆنی ڤۆدگاو ویسکی ورشانەوەی سەرخۆشکەکانی کۆتای هەفتەی لێدەهات.

وەك سروشت سەرپۆشیکی رەشی قەترانی بدابە ڕووی شاردا تا تاوانەکانی شەو کەس نەیبینێ .ئاسمان قەترانی و چاوی ئەستیرەکان لەتاریکدا نووقاون.

ئەوە سزای سروشتە یەخەی ئەمشارە پرتاوانەی گرتووە .

هەر خوا خۆی دەزانی چەند ئافرەتی برسی و بێکار ئیمشەو لەمشارەدا ئەتدەکرێ ؟ چەند مرۆڤی بێتاوان وبەیاسای بەربەری کەپینال سزادەدرێ .

وەك لەتەك خوادا قسەبکات  سەیرکی ئاسمانی کردوو وابیرکردەوە .

- هەرکەسێك بەم شێوەیە بمانبینی چیرۆیككمان بەئارەزووی خۆی بۆ دەنوسیتەوە .

ئەننا ووتی

- پیویستە بەزووترین کات خۆمان بگەینینە ئیستگەی پۆلیس من دەمەوێ تاوانباریان بکەم بە دەستدریژکرد لێمان

ناتاشا ووتی

- ئەوە دەڵی چی ؟ پۆلیسی چی و یاسای چی؟

- ئەم شارە چەند كەسێكی وەك ئەو زاڵمانە حكومی دەكەن.بڕوابكە ڕەنگە پولیسەكانیش سوارمان ببن.

- چێبكەین؟

- بەزووترین كات خۆمان بگەینینە ماڵەوە.كەس نەمان بینی

- چۆن

تەكسیەك دەگرین.

بۆ ئەوەی خاوەن تەكسیەكان ڕوویان نەبینن لەتاریكی شەقامەكەدا وەستان چەند تەكسیەك هاتن ناتاشا دەستی لێڕانەگرتن

- بۆ ڕایان ناگریت ..ئەننا ووتی

- چاوەڕی تەكسەیەكی كۆن وشەقوشڕدەكەم

- بۆ ؟

- چونكە ئەوانەی تەكسی نۆیان پییە بەشێكن لەدڕندەكانی ئەمشارە .تەكسییە كۆنەكان یان پیرەمیردن یان كەسانی هەژارن . پیر و هەژار بەزیی لەرۆحیاندا هەیە گەنجەكان زۆردرندەن .ئەم شارە یاسای خۆی هەیە دەبێ فیرببی.

تەكسیەكی لادای كۆن لەتاریكی شەقامەكەدا وەستا سواربوون كابرای تەكسی كەئەو دیمەنەی بینی ئازاریكی زۆریخوارد ئەننا هیچ قسەیەكی نەكرد تەنیا ناتاشا بەزمانێكی پاڕانەوە وتكا ووتی

- تكایە خراپ لێمان مەگە وتاماڵەوە بمانگەینە وپارەشمان پیە .

- كچم پارە گرنگ نیە دەزانم قوربانی دەستی كێن . منیش باوكم كچێكم هەیە بڕوابكە لەم زەمەنەدا لە بونی پەشیمانم . نامەویت

بزانم بۆ واتان لێهاتووه. ئەوەندە دەزانم هێندە خۆشبڕوامەبن بە پیاوان و بە دیاری و پارە هەڵەخەڵتین.

بەدەم قسەوە تابەر ماڵەوەبردنی , پارەشی لێوەرنەگرتن.

شەوێك لەشەوانی دوو مرۆڤی پاك و قوربانی.

شەوێك ڕۆمانی ژانی شارێکی تێدا دەنوسریتەوە وپاڵەوانەکانی ئەو ڕۆمانە دڵخۆش نین بە ڕۆڵی نێو ڕۆمانەکە.

دوو هاوڕیی هێژاو دوو جەستەی پاك و فریشتەی عاشق باڵشکاو بوون بە نێچیری چەند دڕندەیەکی قسەکەر.

لە شوینژینەکەیان وەك شەرم لە بوونی خۆیان لە چاوی دراوسیکانیان خۆیان حەشار بدەن دەرگاکەیان تووند داخست. پەردەکانیان یەکلاکردەوە .

دوو رۆحی سووتاو و دووجەستەی بریندار بەرامبەر بەیەك دانیشتبوون.خۆشیان نەیاندەزانی چی بکەن ناتاشا بەدەستێکی لەرزۆکی توڕەوە دەستیی کرد بە جانتاکەیدا و چەرخەکەی دەرهانی وجگەرەکەیەکی داگیراسن ومژێکی قوڵیدادا.

نەك پەنجەی هەڵگری جگەرەکەی کشت جەستە لەتورەبووندا کەوتبوە لەرزە.ملی نابوو بەلارەوە تك تك فرمیسك لەچاوەکانی دەرژا,جارجارەش بەهەستێکی بەزەیی سەیری یەکتریان دەکرد ولەناخەوە بۆ یەکتر دەگریان. لەوساتەوەی ببون بە هاوڕێ یەکەمجارە لە ئازارێکی هاوبەشدا پێکەوە بگرین.

ژیانی ڕابوودویان هەمیشە جوانی وسادەی وخۆشەویستی بوو.

ئەننا سەیری ڕووی شینەوە بووی ناتاشای دەکرد .

ناتاشاش سەیری جیپەنجەی زللەکانی ڕوومەتی ئەننا و جێگازو مژینی شنبووەی مەمك وگەردنی ئەننای دەکرد.

هەریەکیەیان چاوەڕی زانینی چیرۆکی ئەوەی تریان بوو.

ناتاشا لەناخەوە هەستی بە ئازار و شەرمێکی زۆرتر دەکرد بەهۆی ئەوەوە ئەننا تووشی ئەم کارەساتە بووە.

ئەنناش خۆی بەتاوانبار دادەنا بەهۆی جوانیەکەی ئەوە ناتاشا توشی ئەم گرفتە بوو.

لەبەرخۆشەویستی بەرامبەر بەیەکتری کەسیان لەروویان نەدهات ئەویتریان تاوانباربکات.هەردووکیان قوربانین هەر هۆیەکی هەبێ گرفت نیە گرفت بۆ سوکایەتیان پێبکەن.

لەبەرئەوەی ناتاشا شارەزاتربوو لەسیستەمی سان پیترسبۆرگ و رەستورانەکە.بۆیە تاوانی تاوانەکانی خستبووە کۆڵ ویژدانی خۆی لەناکاو دایە پرمەی گریان و باوەشیکرد بەئەننادا بەدەنگیکی کز و پارانەوەوە ووتی :

- ئەننا بڕوابکە ئەمەویستی من نەبوو.خەچاڵەتم بەم شێوەیە کەوتەوە .دەزانی چیان لە من کرد دایە گرێانێکی زۆر

- چیان لێکردی؟

- ئەو زاڵمانە بەدوو پیاوهاتنە وێزەم من خۆم تەسلیمنەکردن پیاویکێیان دەیگرتم وئەوی تریان سیکسی دەکرد توانام بەرامبەریان تەنیا قیژاندن بووهەندی جاریش دەمیان دەگرتم هەریەکەیان

بەرزایك بوون چیبكەم دوای ئەوەی ماندویانكردم بەهەردووكیان هاتنە ویزەی جەستەم ئای كە ئازارمخواد لەدواوە ولەپیشەوە سیكسیان لەتەكداكردم ؟زۆر ئازاریاندام لەتاو ئازارهەردەمقیژان پشت و پیشەوەیان پركردم لەئاوی پیسیان چیان لێكردم سوكایەتیانپیكردم لێاندام.نازانم چۆن بوو بۆچی لەدەرگاكە دراو پیاوەكان لێم دۆركەوتنەوە پاش چی

بێدەنگیەك سەرپۆشیكی تەڵخی خەماوی پڕئازاربوو نەك هەناسەكانیانی بەڵكو تەواوی ژوورەكەی لەخەم داپۆشیبوو...

ناتاشا بەئەسپایەوە ووتی

- ئەی تۆ ؟

- چەند پیاو بوون؟چێان لێكردی؟

- بۆچی گەردنت و لارروومەتت شینبوونەتەوە ؟

- تەنیاخاوەنی رەستۆرانەكە بوو.لەسەرەتادا زۆر بەرگریەكی زۆرم لەخۆم كرد بەئاسانی خۆم نەدابەدەستەوە ولێمنزیك بووە بەزللەیەك تاسانمی(ئاماژە بە ڕوومەتیكرد)بڕوانە چۆن جیپەنجەكانی شینبونەتەوە چنگی لە قۆرگم گیركرد تاساندمی تەنیا بەئاستەم هەناسەمدەدا لە ترسی ئەوەدابووم بمخنیكینی وبە مردووی سیكسم لەتكدابكات.

لەسەرپیخەفەكە پاڵیخستم خۆی ترازانە نێو ڕانەكانمە ئاژەڵانە جەستەمی پیسكردڵینجاوی پیس ڕژانە نێوگەڵمەوە

جاری دووهەم زۆر سەیر بوو ...

- بۆ سەیر بوو. چی ڕوویدا ؟

- من لە شەرمم وئازار و ترسدا بەدەمدا پاڵکەوتبووم دەگریام. لەوساتەدا ڕێزی دایکم تاپەرستن وەك خوا زیادی کرد ئا لەوساتەدا ووشە جوان ورِستە بەپێزەکانی دایکم هاتەوە یاد کە ووتی :

- کچم سان پیترسبۆرگ وەك دەریایەك وایە پڕە لەنەهەنگی برسی جەستەی تۆش جەستەیەکی ناسك و گۆشت شیرینی ئاگات لە خۆت بێت .

- ئەمە هوشیاریە پێش ڕووداوەکان پێشبینیت هەبێ ئەوەی دایکم لێترسابوو بووبە بەشێکی پیسی مێژووی ژیانم.نەك من هیچ مرۆڤێك کە لەدایك دەبیت ئارەزووی چەوسانەوەی نیە ئەوەی مرۆڤ دەکات بە درندندە تەنیا بەرژەوەندیە.

- زۆر دەترسام نەمدەزانی تەنیا بە ژەمی سیکس وازم لێدەهینی یان بەئاسانی دەمکوژیت ولەدارستانیکدا تورمدەدا, ئا لەوساتەدا تەنیا بیرم لە ئەلکسەندەر دەکردەوە من دەمرم و جارێکی تر ئەو نابینمە.

- من لەترساندا جووڵەم لەخۆم بریبوو.بەدەمدا کەوتبووم نەمدەویرا سەیری چاوەکانی بکەم .

- لە دواوە سۆار لەشم بوو ئەمجارەیان ئازاری جەستەی نەدام بەپێچەوانەوە زۆربەئارامی تەکانی دەدا وچەندجاریك هەوڵیدا لێوەکانم بمژی من ڕێگەم نەدا . بۆشی مژیم یەکمجارە دەمی پیاو بە

ناوگەڵم ئاشنا ببێ بەزمان پشتمی دەلستمەوە هەستمکرد بۆنی قژمدەکات من وەك مردویەك هیچ جووڵەیەکم نەبوو تەکانەکانی ئەویش زۆر ئارام بوو.

ئیمشە و من هەستمکرد هەموو هاوکیشە کۆمەڵایەتی و پەیوەندیەکان بەوشیوەیەنیە کەمن نەخشەم بۆکیشاوە رەنگە نەخشەی من بۆژیان پەیوەندی بەو سروشتە روحی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەوە هەبێ کە من و ئەلکسەندەر و تۆ ملیوینەها مرۆڤی روسی بەجوانی پەروەردەکردوە ئیستا لەسایەی گۆرباشۆڤەوە نەکیشە رۆحییەکان تەرازووی گشت پەیوەندیەکانی نیوان مرۆڤ رما.من بیر لەو حەزە بیسە دەکەمەوە کە لە نێوان ناوگەڵی تووکنی پیاودا کۆبووتەوە و بە هەرشێوەیەك بێت گەرەکیانە گری شەهوەتیان ساردبکەنەوە.

پرسیاری من لەوەدایە بۆ دەبێ بەزۆر ولێدان وئەشکەنجە وئەتکردن ناوگەڵی ئافراتان بکەن بە لابۆرێك بۆ حەزی خۆیان؟ ئەوان پیاوان دەتوانن بەرێگەی خۆشەویستی خۆیان ئارام بکەن نەك لێدان و سوکایەتی کردن بەمرۆڤێکی تر.

ئەو دووجار ناوگەلی منی پرکرد لە شەهوەت.

چ ئارەزووەیەکە هاوسیکسەکەت وەك تۆ بەختیارنەبێ؟

ئەمە وەحشییتیە.بەزۆر سیکسکردن.نازانم پلەی هوشیاری ئەومرۆڤ درندەیەی ئیشمەومنی چەوسانەوە چەندەیە ؟ لێ دەزانم تامردنی ناتوانی کەسێکی خۆش بووی.خۆشی بەختیار نابێت ئاخر هەر خۆشەویستیە مرۆڤ بەختیار دەکات نەك سامان.میلۆینەها دەوڵەمەند

مردن ودوای خۆیان سامانێکی زۆریان جێهێشت و له میژوودا ووشەیەکی جوانیان نیە. ئەی ئەو عاشقەی بەعاشقی مردو دوای خۆی تەنیا پارچە شیعرێك یان نامەیەکی جوانی دڵداری بۆ میژووی خۆی بەجێهیشتوە ؟

- کوامێیان زیندووە؟
- میلوینەرەکە یان عاشقە هەژارەکە؟
- ئەم پرسیارە لەویژدان ناکرێ تەنیا لە هوشیاری مرۆڤ دەکرێ دەزانی بۆ؟
- نا
- مرۆڤی هوشیار پیویتسی بەویژدان نیە .
- بۆ
- چونکە هوشیاری پێوەری گشت ویژدانێکە .
- گەر مرۆڤێك نەتوانی خۆشەویستی بکات . ناتوانی ژیانی جوان بکات.خۆشەویستی بۆمرۆڤ گەورەترین وتاقانەترین سەرچاوەی ووزەی جەستەو رۆحە,ئەوان چیان لەجەستەی ئێمەی ئافرەتکرد؟
- دەمەوی پرسیاربکەم دوای رەحەت بوون و ئارامبوونەوەی گرێ ناوگەڵیان چۆن بیردەکەنەوە؟
- چۆن دەژین؟
- ئەوان لەناوگەڵی ئافرەتیکەوە هاتوونەتەوەبوون کەدایکیانە.دەبێ تادواچرکەی ژیان رێز لەئافرەت بگرن.بۆیەکمجار لەتەك ئەلکسەندەردا سیکسمانکرد تەمەنم 17 ساڵ بووم ساکار وکاڵ

ئاگامان لەجیهانی رۆح وحەزو رۆمانسیەت نەبوو لێ کە بیرلە یەکەم ژوانی سیکسم دەکەمەوە ئەلکسەندەرم زیاتر و زیاتر لاخۆشەویست دەبێ یەکەمجار ئەوتەنەیا هاورێم نەبوو بەڵکو مامۆستایەکم بووفیری ئەوەی کردم چۆن سیکس تێکەڵاوی خۆشەویستی دەبێ.

- جوانترین ساتی ژیانم ئەو ساتەو بوو بۆیەکمجارلەژیرجەستەی ئەلکسەندارد ا رەحەت بووم ناشیرینترین و قیسترین سیکسی ژیان سیکسەکانی ئیمەش بوو.

( ئەننا ئەم چیرۆکە بەراورداریانەی دەگیڕایەوە فرمێسکی چاوەکانی تەقیبوو)

- ئەلکسەندەر نمونەی پیاویکی جوانە بۆ ژیان. پیاو درندەکانی ئیمشەویش مرۆڤە بیرۆحەکانن دڵنیام لەژیاندا بەختیارنابن با دەوڵەمەند وسامانێکی زۆر ڤیلا وکۆمەڵە چەتەیەکشیان هەبێ . گرنگ نیە گرنگ خۆشەویستیە بەنرخترین سامان بۆ مرۆڤ خۆشەویستیە ئەوان نیانە.

- ئەوان وەك مرۆڤ زۆر هەژارن.

- وەك ئاژەڵ دەوڵەمەندن.ڕەنگە خێزانیشیان وکۆمەڵی منداڵیشیان هەبێ ؟ ئەوانە تاوان لەخۆیان وژن ومنداڵەکانیشیان دەکەن کەسێك تاوان بەرامبەر بەمرۆڤێکی لاواز بکات ناتوانی ببێ بە ڕابەرێکی باش بۆمنداڵەکانی.

- ئەو پیاوانە ئاژەڵن لەپێستی مرۆڤدا.

***ماوەیەك تێپەڕی هەردووكیان لەشوینژینەكەیاندا دەژیان.لەترسی چاوی كەسان ئەوساتانە دەچوونە دەرەوە بۆ كڕینی پیویست كەتاریك داداهات . تا شینی ڕوویان نەبینرێن.***

***ڕۆژێك هەردووكیان وەك دوو مرۆڤی بریندار.ڕۆح وئایندە تەڵخ.وەك دووهاوڕی بەئەمەكی ژیانی سادەی دێیەكی سادە . نامۆ بەدونیای جەنجاڵی كەپیتاڵ وبازاڕی بێ مۆراڵی تازە .***

***دانیشتبوون.***

***سەرتای ژیانەو ژیانیش پیویستی بە نەخەشەی مسۆگەركرنی ئایندە هەیە.***

***ناتاشا لەغەمی ساریژبوونی شیینی ڕوویدا بوو.***

***ئەننا چاوی بڕیبووە ڕووناكی پەنجەرەی باڵكۆنەكە.***

***خورپەیەك دووخورپە.چەندخورپەیەك ڕایچڵەكان وەك تەزووی كارەبای لێبدا ڕاپەڕی ڕوویكردە ناتاشا بەدەنگی بەرز پرسیاری لێكرد.***

***- ناتاشا ئێمرۆ چەندی مانگە؟ ئێمرۆ چەندی مانگە؟***

***ناتاشای بەپێكەنینەوە ووتی :***

- ***بۆ ؟***
- ***چاوەڕی مۆچەی مانگەدەكەی؟***
- ***بۆچی دەتەوی بزانی چەندی مانگە؟***
- ***نا چاوەڕی موچە ناكەم***
- ***ئەی چاوەڕیی چیت؟***

ئەننا دەنگی کەمێك نزمکردەوە. نزيك ناتاشا بووە هەردوو دەستی لەنێو دەستیدا گریدا ووتی :

- ناتاشا لە خوێنبوونی مانگانەم دوا کەوتووم . دەترسم سکم پڕبێت !

- لە کێ ؟

- لەکێ ؟ لەوزاڵمەی کەمنی ئەتکرد. لەبایلوژیتی مرۆڤدا سروشت گوێناداتە زاڵم ومەزڵوم .

بەترسێکی دەروونیەوە .

- کارەساتێکی پیس بوو من و تۆی تێکەوتین کارەساتی دوای لەوەدایە ئێمە لە پیاوانێکی پیس و زاڵم سکمان پڕ بێت؟ دەکەوینە نێوان دوو کەوانەی ویژدان و تورە بوون وتۆڵەوە.

ناتاشا بەسەرسامیەوە

- تۆڵەی چی و تاوانی چی بۆ ڕونتر نادوێ ؟

- ئێمە کارەساتێك یەخەی گرتین ویستی کەسمان و هەڵەی کەسمان نەبوو. تۆ دوو زاڵم سێکسیان لەگەڵکردیت و منیش زاڵمێك.

کاتی خوێن بوونی مانگانەی خۆم دەزانم.واهەفتەیەکە لەخوێن بوونم دوا کەوتووم . ئەمە ئاسایی نیە . ترسم سك پڕبوونە لەکەسێکی ترنەك خۆشەویستێکی وەك ئەلکسەندەر.لەکاتیکداچاوەڕی دیداری ئەوم.

چاوەکانی پڕبوون لە فرمیسك و هاواری دایکی کرد

- ئۆف خوایە دایە گیان چەند هوشیاربوویت پێش ڕوداوەکان کەوتیت ومنت ئاگادارکردەوە ئەمە هەستی بەرزی دایکایەتیە بەرۆحەوە لەتەك چرکەی ژیانی کورپەکەیدا دەژی.

فرمیسکەکان هورشمیانکرد قەبارەی چاوەشینەکانی بواری حەشاردانی فرمیسکەکانی نەبوو تك تك ڕژانەخوارەوە ڕێچکەی کارەساتێك وخەمێکی تەڵخی دەرونی ئەنناپان دەتکانە سەر زەوی .

ڕوویکردە ناتاشا

- ئەی تۆ ؟ لە خوینبوونی مانگانەت دوا کەوتووی ؟

- ناهیشتا کاتم ماوە.ئەوساتەی ئەو ڕووداوە روویدا من ڕۆژێك بوو لە خوینبوونم پاکبوومەوە ئەو ترسەم نیە .

- ئەگەر سکت پڕبوو چیدەکەیت ؟

ناتاشا : بێ دوودڵی بەدەم پێکەنێکی گاڵەتە ئامێزەوە

- فریدەدەم ...چیدەکەم ؟ ئەوە کەی گرفتە بە 50 دۆلار خۆم ڕزگارد دەکەم .

- فرپدانی منداڵ کوشتنی مرۆڤێکە چۆن کاری وادەکەیت ؟

- ئەوەندە ڕۆمانسیانە مەروانە ژیان .ڕۆژانە سەدەها منداڵ لەم شارەدا فرێ دەدرێتە تەنەکەی زبڵەوە.نەك منداڵ چەند لاومان لەئەفغانستان دەکوژرین؟هیواکانیان دەچیتە گۆڕەوە؟چەند سەربازمان ئیفلیج بوون لەسەرشەقامەکان سۆاڵ دەکەن؟ ئەمە یاسای ئەم زەمەنیە.من دووپیاو سێکسیان لەگەڵکردوون؟ هەردووکیان پیش وپشتەوەیان پڕکردوم

لەشەهوەت.نازانم کورپەی من بەری شەهوەتی کوامیانە ؟ کورپەیەکم ناوێت باوکی زاڵم و نامرۆڤ بێت.

- کورپە چ تاوانێکی لە زوڵم وتاوانمی باوکی هەیە ؟

ناتاشا تورە بوو بەدەنگی بەرزەوە ووتی:

- تۆ ئامادەی ببێ بە دایکی کۆرپەیەك کە باوکی ئەتکتبکات؟

گفتوگۆکەیان قۆزاغەیەکی تورە وپەرژینێکی درکاوی لەباوشیگرت بۆیە هەردووکیان بێدەنگ بوون.

ئەو شەوە ناتاشا بەرامبەر بە تەلەفزوینەکە و سەیرکردنی فلیمیك لە سەر چرپاکە خەوی لێکەوت.

ئاننا‌ش بەخەفەتەوە لەسەر پێخەفەکە بەدەمدا باڵکەوت کەوتە خەوێکی ئاڵوسکاوەوە .

کاتی بەرچای بەیانی بوو ئەننا وەك هەناسە بەرۆحی شوینژینەکەیان بدا قاپی پەنجەرەکەی ترازان و هورشمی هەوای پاك گەروی ژوورەکەیانی پاراوکرد.پێش ئەوەی ناتاشا لەخەو بەئاگابێتەوە مێزی خواردنەکەی ڕازاندبووە قاوەی دەمکردبوو.

ناتاشا بەیانی باشی لەئەنناکرد بەمەبەستی لێبوردنی گفتوگۆکەی شەوی ڕابووردوو باوشپیداکرد هەردووکیان لەدۆخێکی سایکۆلیجی خراپدا دووان .

- بڕوابکە هێندەی پێبزانی ڕێز وخۆشەویستم بۆتۆ هەیە.دڵنیام تۆ لە من هوشیارتری.دەزانی بۆ؟

- نا

- چونکە تۆ دایکیکی خوێندەوار و باوکێکی خاوەن ئەزموونت هەیە.
دایك وباوکی من دووکەسی زۆر بەرێز وخۆشەویستن لێ ئەوان خۆیندەواریەکی کەم و تێروانێکی تەسکیان بۆ ژیان هەیە.
سنوری جیهانی بیرکردنەوەی ئەوان لە خانوەکەیان ودیکەیان زیاتر نیە.ئەمە ئەو راستیە دەگەینی من تۆ ودەبێت ئەو جیاوازیە ببینین.هەردووکمان چاوەڕی کارەساتێکی دوای کارەساتی ئەتکردنی رۆح وجەستەمانین بۆیە ئاساییە تیڕوانینمان جودابێت . نازانم سکم پڕدەبێت یان نا . لێ پرسیارەکە یەخەی تۆ دەگرێت.چونکە من بڕیاری خۆم داوە پێش ئەوەی بزانم سکم پڕە یان نا , منداڵێکم ناوێت کە باوکی زاڵم و بێ ویژدان بێت و ئافرەت وجەستەی وەك بازیەك بۆ ناوگەڵی بۆ شەهوتی بۆ ئارەزووی سیکسی بەکاری بهێنێ.
گرفتی ئێمەی میێ تێنەگەیشتنی نێرە لە بوونی ئێمە.
ئێمە وەك بەشێکی زیندو پیویستی ژیان وبوون.
پیاوان زۆربەیان وابیر دەکەنەوە ئەگەر خوا هەبێ ئەو خوا ئێمەی میێ بۆ دامرکاندنەوەی گڕی ناوگەڵی پیاو دروستکردوە.
ئەمە تیڕوانینی ڕێژەی زۆری پیاوانە.
بۆیە ئێمە وەك ئافرەت و وەك مێنە ئەگەر بە تیوری چینایەتی پیناسەمان بۆ بکرێت ئەوە ئێمە یەکەم چەوساوەی دەستی دیکتاتۆری پیاو و سیستەمی کۆمەڵگا و دواجار سیستەمی کار وسەرمایەین.
تۆ دەزانی لەم شارەدا ڕۆژانە چەند ئافرەت کاریشیان پێدەکەن و خاوەنکار جگە لەوەی نرخی کارەکەشیان بەراستی ناداتێ . هەرکاتێك

ویستی دەبێ جەستەی ئافرەتی کریکار لەژێر ڕەحمەتی ئارەزووی خاوەن کاردابێت(دەنگی بەرزکردەوە بە تورەیەوە ) ئەی کێ بوو من وتۆی کرد بەو کاڵە بێنرخەی ویستی خۆی ؟ خاوەنکارەکەم نەبوو. دوای ئەوی منیان لەپیش وپاشەوە وتوشیان ئەتکرد . لە کارەکەش دەریانکردم . تکایە لێم تێبگە ئەمە نە رەخنەیە نە گەلەییە لە تۆ.من وتۆ قوربانی بووین قوربانی جوانی و سیسیتەمی ئەم سەردەمە.

دەتسیکرد بە دەمیەوە بۆ ئەوەی دراوسییەکانی هاوار وقیژەکەی نەبیستن.وهێندە گریانکەی بە کوڵ بوو جەستەی بەبێ دەنگی دەلەرزان .

ئەننا چونکە لەبواری پیسۆلۆگی سۆسۆلیگیدا پسپۆر بوو .زۆر ئارام ئەو دۆزە دەروینیەی ناتاشای دەخویندەوە .

گریان وتورەبوون توڕدانی پەرداخ.دڕینی نامە. زللە .تف .هاوار. .گشتی بەتاڵکردنەوەی دەروونی تورەییە .

بەدەم قاوەخۆاردنەوە گۆی بۆ ناتاشا دەگرت لەبەرقسەکردن بواری پاروو دروستکردنی نەبوو ئەننا پاروی بۆ دروستدەکردوو.قاوەی گەرمی دەرژانەی کوپەقاوە ساردەکەیەوە.

ناتاشا زۆر تورە و بێ ئارام . ئەننا ئارام و لەسەرخۆ گۆیدەگرت

دوای بەتاڵکردنەوەی دەروونی

ناتاشا ووتی :

- ئێمە هەردووکمان نازانین چێمان بەسەردێ.

ئەگەر من سکم پڕ ببێ . ئەو کۆرپەیە پەسەند ناکەم .

- بۆ ؟
- ئەی کە کۆرپەکەم پرسیاری باوکی کرد . بڵێم کێ باوکتە ؟
- لە ئەنجامی چ پرۆسێسێکدا تۆ دروستبووی ؟
- رێکەوتێکی رۆمانسی وشەوێکی هەرزەکاری؟
- یان خۆشەویستی و بەڵێنێکی درۆ؟
- ئەی ئەگەر بڵیم باوکت و پیاوێکی تر بەجووتە منیان ئەتکردو تویان دروستکرد.پێمدەڵی کوامیان باوکمە؟
- ناتوانم بڵێم کوامیان.کەواتە ئەوکورپەی تا دەژی لەخەمی باوکی رەسنیدا دەژی وەك دایك ناتوانم وەڵامی پرسیاری کۆرپەکەم بدەمەوە بۆیە بریارم داوە ئەگەرسکم پربێ هەر لەیەکەم هەفتەوە کۆرپەکەم فریدەدەم .

ئەننا بەئارامیەوە گۆی بۆ ناتاشا دەگرت و لەناخیشەوە دژی بریارەکەی بوو.

ئەننا ووتی

- ناتاشا ئەمە رێکەوتە یان نەخشەی خوا یان سروشت نەتۆ خوشك نەبرا نەمن نەخوشك نەبرامان نیە . ئێمە رۆژگاری کردینی بەدوو خوشك.لێ لەنێوان دوو خوشکدا جیاوازی هزریش هەبێ ئاساییە وەکی تۆ تیروانینم بەرامبەر بەو کێشەیە نیە. راستە من وتوو دوو قوربانی چلیسی کۆمەڵە پیاوێکی بێوژدان و بێ مۆراڵی ئەم کۆمەڵگایەن.
- ئەی تاوانی ئەوکورپەیە چیە.؟ هیچ لەمانای تاوان تێناگات ؟

ئێمە تاوانبارین بەکوشتنیان .کوشتنی مرۆڤێك زۆر پیستر و تاوانترە لەژەمی سیکسی بەزۆر.مرۆڤ کە لەدایك دەبێت بە پاکی لەدایك دەبێت ئەوە گرفتی کۆمەڵگایە وویستی تاکە پیسەکانە کۆمەڵگا بەروپیسی و سیستەمی مافیا و بازاری بەرڵادەبات.

- من باوکم زۆر خۆشدەوێت. لێ دایکم لەتەك هەرتنۆکی شیری مەمکی ووشەیەکی جوانی پێنووشیوم .باوکم ئەفسەری سوپابوو فێری ئەوەی کردووم چەند تاوانە مرۆڤەکان یەکتری دەکوژن.رۆحی سروشت ئاشتیە و مرۆڤە دڕندەکان دەیشێوێنن.

کەمێك بێدەنگی لەنێوانیاندا دروست بوو .ئەنا بەدەنگیکی نزم وبە هێز و بڕوایەکی باڵاوە (دەستێکی بۆ سکی برد) ووتی:

- بەهیچ شێوەیەك لەتەك کوشتنی مرۆڤدا نیم نازانم سکمپڕە یان نا . هەرچۆنیك بێ ئەگەر بووم بەدایك بیرلەتاوانەکانی باوکی کۆرپەکەم ناکەمەوە بیر لەوەدەکەمەوە وەك دایك چۆن کورپەکەم لەم کۆمەڵگا پڕ ئاشوب ونایەکسانەدا پەروەردە بکەم .

- دەکرێ کۆرپەکەم باوکی مافیا بێ . بۆمنی دایك دەتوانم پەروەردەیەکی بکەم نەك من وەك دایك نەتەوەی روس شانازی پێوە بکات. گاگارین لەسەرەتدا کۆرپەیەکی ناسك ودواجار گەنجێکی چالاك وئایندە . یەکەم مرۆڤ توانی بگاتە مانگ. زاخاروف ئەو مرۆڤە مەزنەی ئامادە نەبوو تواناکەی بۆ کوشتنی مرۆڤ بەکاربهێنێ.گەیشتە ئەو ئاستەی ڕابەرایەتی بزوتنەوەی مرۆڤدۆستی بکات.

ئەوکەسایەتی سیاسی و وێژەیی وزاناکانی جیهان بەتواناییان ڕەوتی مێژوویان گۆڕیوە گشتیان لەسەرەتادا کۆرپیەکی چەندرۆژ ولەقوتابخانەی دایکێکی هوشیاردا پەروەردە بوون.

سەرەتای هەموو ڕۆژێکی نوێ . سەرتای نووسینەوەی مێژوویەکی نوێیە

- چۆن هیچ کردارێك لەدەروەی سنوری هوشیاری مرۆڤەوە نیە . ئاواش هیچ دۆزێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی هوشیاری کۆمەڵگاوە نەیە .
- ناساونترین پیاوی دونیا عیسی یە کەس نازانی باوکی کێیە؟
- ئەو درۆ زلەش کەدەڵێت باوکی عیسی خوایە .درۆیەکە لەخوا ومرۆڤ کراوە. چۆن ئافرەت لەدەمەوە سکی پڕدەبێت ؟

- من بەو درۆیە دەڵێم درۆی جوان . چونکە بەهۆی ئەو درۆیەوە نەمریەم کوژراوە ونەکۆرپەکەی کەعیسایە .عیسا لەدایك دەبێ منداڵێکی ئاساییە بێ باوکە ئەوەپاکی مریەمە کۆمەڵگا باوکێکیان بۆ داتاشیوە ناویاناوە خوا . خواش کەس نەیبینوە کەسیش نابینێ .ئەگەر خوا بوونی هەبێ و بێتە زمان بە دڵنیایەوە ئەو درۆ زلە پەسەند ناکات.

- من ستایشی ئەو مرۆڤە هوشیارە دەکەم کەمریمی بەدرۆیەك لەکۆشتن رزگارکرد.ستایشی مریم دەکەم کۆرپەیەکی بێ باوکی جوان پەروەردەکرد .

ئەو درۆیەی بۆ مریمیان کرد ئەنجام منداڵێکی بێ باوك ڕەوتی ملیاردەها مرۆڤی گۆڕی عیسی کەسێکی شۆرشگێربوو.کەسێك بووسیستەمی مرۆڤایەتی ئەو سەردەمی خستە ژێر پرسیارەوە.بۆیە تائیستا ملیاردەها مرۆڤ ڕیبازەکەیان لا پیرۆزە . مسیح لە هەموو پارتە سیاسیەکانی ئەم دونیایە بەهێزترە وگرنگترە , ئا ئەوەی مسیحی دروستکرد هزری مسیحیتی دارشت کۆرپەیەکی بێ باوك بوو . بۆیە بۆمن گرنگ نیە باوکی کۆرپەکەم کێیە.گرنگ وەك دایکێ چ ڕۆڵێك لەئایندەی کورپەکەمدا چ کچ بێ یان کوڕدەبینم .

(لەناتاشا نزیك بووە دەستی خستەسەردەستی)

- کاتێك مرۆڤ توشی هەڵەی گەورە دەبێت.کە لە هەڵەی پچوك تێنەگات

- هاورێ شیرینەکەکم پەیوەندی و ڕێز و خۆشەویستی ئێمە سنوری هاوڕێیەتی بەزاند ئێمە دوو هاوڕین تا من مابم تۆخوشك و هاوڕێ و دڵسۆزتم.تۆش هەروا لێ با بڕیاری ژیانمان جودا بێت.تکایەکم هەیە.کەی نهێنی ئەلکسەندەرم پێ دەڵێت؟
- من دەزانم تۆ گشت نهێنیەکان لە رۆحدا حەشارداوە. نەدرکاندنی خۆشەویستیە نەك دوژمنایەتی . ئیمرۆ بێ یان سبەینێ دەبێ ئەو نێهینیەم بۆئاشکرابکەیت , من کەسێکم لەژیاندا چاوەڕی گشت ڕووداوێکم . خۆش یان فرمێسکاوی گشتی تابلۆیەك پێکدەهێنن کەپێدەڵێن ژیان.زۆرت لێناکەم لێ دەپرسم بۆ ڕاستیەکانم پێ ناڵێت؟بڕوابکە چاوەڕی هەموو ئەنجامێکم . ئەمە ژیانە.

ناتاشا گوێگری ووشەو ڕستە جوانەکان وهەڵویستە بەهێزەکانی ئەننا بوو لە دوودڵیدا دەژیا.

چۆن ڕاستی کارەساتی کوشتنی ئەلکسەندەر بدرکێنێ چاوەکانی لەچاوی ئەننا گیرکرد بەبێ دەنگی لەرۆحەوە دەدوان.

هەستیکرد نهێنەکانی رۆحی ناتاشا فرمێسکی پێوەیە بۆیەی سڵ لە درکاندنی دەکاتەوە . ئارامی گرت و بە هەردوو دەستی سەری ناتاشای گرت و ڕومەتەکانی ماچکرد .ووتی

- بڕوام وایە وەك من تۆش لەچاوەڕوانی ساتێکدایت ڕاستی هەواڵی ئەلکسەندەرم پێبڵێت؟ دەزانم بانکی زانستیەکان تۆیی زۆرت لێناکەم ڕەنگە تۆش تاکتێکی تایبەتیت بۆ درکاندنی ڕاستیەکان هەبێ ؟
- ئەوەی جوانە بە ئازادی و ئاسودەیەوە پێم بڵێ.
- کارەساتەکان بەشێکن لەژیان.دەبێ ئاشکرابێت . من چاوەڕێم تۆش ئازاد.
- دەزانم ئەو نهێنیەش دەرونی تۆی بەئازار قانداوە. دەبیدرکینە یان پێکەوە بۆ چارەنوسێکی تر دەگرین.
- یان چاوی چاوەڕوانیم دەکەمەوە بەرێکەوت جارێکی تر بەدیداری ئەلکسەندەرشاد دەبمەوە .

ناتاشا بەهوشیاری و ئارامی ئەننا سەرسام بوو ئەوی پێکرا بۆ خۆ قوتارکردنی لەو دۆزە مێزی خواردنەکەی بەجێهیشت و چووە بالکۆنەکە جگەرەیەکی داگیرسان ولەترسی دراوسیکانی چاویلکەیەکی

ڕەشی لە چاوکرد.لەتەك هەموو مژێکدا ووشەیەکی کارەساتی کوشتنی ئەلکسەندەری هەڵدەمژی.دەیوسیت بەزووترین کات ڕاستیەکان ئاشکرابکات لێ لەدووی یەکەم ووشەی ڕستەی یەکەمی چیرۆکەکە ویڵبوو. ئاوڕی دایەوە بینی ئەننا خەریکی کۆکرنەوە و پاککردنەوەی مێزی خۆاردنەکەیە تێگەیشت چ هاوڕێەکی هوشیاروبەهێزی هەیە . نیگاکانی تیژترکردەوو زیاتر لەئەنناى ڕوانی.لەدڵەوە ئیری بە هێز و هوشیاری دەبرد ولەهەمان ساتیشدا شانازی پێوەدەکردکەسێکی وەك ئەننا بۆتە خوشك وهاوڕێ.

باڵای جگەرەکە گەیاندە سنوری فلتەرەکەی.

دوامژی لێدا وفریدایە سەرشەقامەکە و چووبەردەستشۆرەکە بۆ ئەوەی بۆنی دەمی دووکەڵاوی ئەننا نارەحەت نەکات دەمی شت .

مێزی خۆاردن وچیشتخانەکە پاکرابووە .

ئەننا لەوی نەبوو لەژووری نووستنەکەدا.لەسەرکورسیەك دانیشتبوو دەیرڕوانیە ڕووناکی پەنجەرەکە و هیوا نادیارەکانی خۆی تێدا تەتەڵەدەکرد. ناتاشا وەك خۆی ئامادەبکات بۆگێڕانەوە چیرۆکەکەی ئەلکسەندەر.

لەئەننا نزیك ببوە بەمەبەستی شڵەقاندنی بیرکردنەوەی .

دەستێکی بەسەریدا هانی و ووتی:

- ئەوەچیە بۆ بێدەنگی.بەلەمی بیرکردنەوەی ئەندیشەت بەرەو کوام کەناری نادیار دەبیت؟

ئەننا چاوەکانی لەڕووناکی پەنجەرەکە نەتروکاند و بەدەم سەیرکردنەوە ووتی:

- ژیان بێ هیوا کۆتای هاتنی تەمەنە.

- گرنگ نیە تەمەن چەندەیە . هەرکەسێك هیوای بەژیان نەما یانی بڕیاری مردنی خۆی داوە. ئەوکەسە نامرێت کە بڕوای بە بەرنگاربوونەوەی گرفتەکانی ژیان هەیە. کەسانێکی زۆرهەن وەك جەستە بوونیان لەسروشتدا نیە لێ چونکە مردنەکەیان لەپێناوی ژیان وهیوایەکدا بووە .دوای مردنی جەستەشیان وەك مرۆڤ هەمیشە بوونیان هەیە. کەواتە ژیان تەنیا هەناسەدان نیە ژیان سوربوونە لەسەر ژیان وهیواکانی .

ناتاشا : باوەشی بەسەری ئەنناداکرد ووتی :

- چەند دڵخۆشم بەم ئازایەتیەت .هەموو ووشەیەکت .بۆنی دەمی دایکتی لێ دێ

- نا نەك تەنیا دایکم.باوکیشم باوك ودایکم خۆشەویستیان جەستەی نەبووبەڵکو بیرکردنەوە وبڕوابوو.ڕاستە دایکم یەکەم مامۆستام بوو بۆ فێربوونی یەکەم ووشە باوکیشم ئەوجەستە بۆن گەرمەبوو کەکۆرپەکەی بە سۆزەوە پەروەردە کرد .

- ئەننا بۆ ئەوەندە راڤە لەسەر کۆرپە و دایك وباوك وپەروەدە دەکەیت؟چ نهێنیەکت هەیە نایدرکینێ.من هاوڕێت نیم خۆشکتم . لەمشارەدا تەنیا من تۆم هەیت و تۆش من. پێمبڵی ئەوداڵی چیت ؟

لەسەر کورسیەکە کەمێك خۆی جوڵاندن و ڕوویکردە ناتاشا

- هیچ نهێنیەك تاسەر ناتوانرێ وونبکرێت.میژوو نهێنیەکان ئاشکرا دەکات.ئەوە راستە هەموو نێهنیەك کاتی درکاندنی خۆی هەیە.ئەو نهێنەی لای تۆ هەیە درکاندنی پیویست بەکات ناکات. من چاوەڕی دوو نهێنیم یەکەم چارەنووسی ئەلکسەندەر. دووهەم من سکم پڕە یان نا

- ئەگەر سکت پڕبوو چیدەکەیت؟

- خۆم دەزانم بڕیارم داوە .

ناتاشا بێدەنگ بوو.ترسی لەپرسیاری یەکەم و چارنووسی ئەلکسەندەر بوو.چەندچرکەیەك بێدەنگی درێژەی کێشا . ناتاشا هەر بێدەنگ بوو

- دەستێکی بەدەستی ناتاشادا هانی و ووتی

- پرسیاری دووهەم بۆ ناکەیت ؟

- ئەگەرئەلکسەندەر بزانی تۆسکت لەپیاوێکی ترپڕبووە.لە تورەبوون وهەڵویستی ناترسی؟ ئایا ئەم نهێنەیە لەئەلکسەندەر دەشاریتەوە ؟

- نهێنی پاراستن قورسایەکی سایکولجی سەختی هەیە. پیویست ناکات لەنێوان دوو خۆشەویستیدا نهێنی هەبێ.من دەزانم بۆپیاو زۆر زەحمەتە پەسەندی ئەوەبکات خۆشەویستیەکەی لەپیاوێکی تر سکی پڕببی لێ من لەدوو بڕواوە نهێنەیەکان دەدرکینم .

یەکەم : بڕواهێنان بەخۆم هیچ تاوانێکم لەدروستبونی ئەو کۆرپەیە نیە.رێکەوت وکارەساتە. دەبێ من و ئەلکسەندەر پەسەندی بکەین.

دووهەم : بڕوام بە ئەلکسەندەر هەیە بڕوای بە من هەیە.

***- ئەی ئەگەر ئەلکسەندەر منداڵی پیاوێکی تری نەویست تۆ ئامادەی خۆشەویستی خۆت و ئەلکسەندەر بکەیت بە قوربانی کۆرپەی پیاوکی زاڵم؟***

***- ئەگەرمن کۆرپەی خۆمم خۆشنەویت خۆشەیستیم بۆ ئەلکسەندەر و تۆ و گشت مرۆڤایەتی هیچ نرخێکی نیە.تەنیا ووشەیەکە و هیچی تر. ئەوەندەی من ئەلکسەندەر بناسم ئەو لەم گرفتە تێدەگات .***

***- ئەگەر وانەبوو . ئەو ویستی کۆرپەکەت بکوژیی .***

***- کوشتنی مرۆڤ بەیەك مانگی یان بەپیری یەك پڕوسیسیە.من لەپێناوی خۆشەویستی ئەلکسەندەردا مرۆڤێك ناکوژم.***

***- دڵنیام ئەلکسەندەریش بەوە رازی نیە .***

***- ئەی ئەگەر ئەلکسەندەر مەرجی بۆ دانایت ؟ کوشتنی گۆرپەکەت یان ژیان لەتەك ئەلکسەندەرا ؟ کۆامیان هەڵدەبژێریێ ؟***

***- ئەو مرۆڤەی دەبێتە هاوژینم دەبێ گشت مرۆڤێکی خۆش بووی نەك جەستەی من وکۆرپەی خۆی . ئەلکسەندەر کەسێکە لەمن زیاتر مرۆڤی خۆشدەوێت چاوەڕی ئەو هەڵویست و داخوازییە لێ ناکەم .***

***- ئەی ئەگەر کردی ؟***

***- ئامادەنیم نەکۆرپەکەم بکوژم . نەببم بە هاوسەری پیاوێك بڕوای بە کوشتنی کۆرپەیەکی بێ تاوان هەبێ .***

***ناتاشا لەوەڵامەکان تاسا و لەهەمان ساتیشدا رێگەی درکاندنی کوشتنی ئەلکسەندەری بۆ ئاسان بوو.***

هیواداربوو ئەننا سکی پڕببێت . بەدەم پێکەنینەوە ڕویکردە ئەننا ووتی:

- ئێمەش سەیرین نازانین سکتیپڕە یان نا باسی کۆرپە دەکەین ؟

ئاورێکی هوشیاری لەناتاشا دایەوە بە چاوەکانی ووتی:

- من چاوەڕی درکاندنی نهێنەکەی لای تۆم .

کات تێپەری وشینی بەرچاوی ئەننا و ناتاشا کاڵبووە.بەمەبەستی هەوا هەڵمژین پیاسەیەك چونە باخچەیەکەوە . پیاسەیاندەکرد.

- ناتاشا نەخشەی ئایندەت چۆنە ؟

- بۆ ئایندەم .. ئایندەمان ؟

- تۆ بەهۆی منەوە توشی بێکاری و سەرسەختیك بوویت .ئەمە ویستی کەسمان نەبوو پێم بڵی چی بکەین ؟

- بۆکارخەمت نەبێ هەربەیانی کار بۆ هەردووکمان پەیدا دەکەم هێندەم پارە پاشەکەوتکردوە مانگیکی تریش بێ کاربین بێ پارە نابین .

- گەرکم نیە ببم بە ئەرك بەسەرشانی تۆوە. دەبێ کاریك بکەم . بزانم هوی دواکەوتنی رۆژی ژنانەم وخوینم بۆ نیە؟

ماوەیەکە تەندروستیم باش نیە پیویستە بچم بۆ لا پزیشك.

***هۆڵی نەخۆشخانەکە جمەی لە ئافرەتان دەهات .***

***هەندێکیان سکیان پڕو هەنێدێکیان لەچاوەڕوانی ئەنجام وچونە ژوورەوەی پزیشکدا بوون .***

***ئەننا و ناتاشا دانیشتبوون چاوەڕی ئەنجامی پشکنینی پزیشك بوون.***

***ئەننا چاوی بەناو ئافرەتاکاندا گێڕا.***

***(ئافرەتێك لەسەرکورسیەك دانیشتبوو پشتی بۆ دواوە ڕێکردبوو چمکی پاڵتۆکەی دابووبەسەر کورپەکەی سکیا بۆ ئەوەی کۆرپەکەی سەرمای نەبێ )***

***- ئەو ئافرەتە بەخۆشەویستیەوە سکی پڕبووە شەیدا ووشەی دایکە هێشتا کۆرپەکەی نەبینیوە خۆشی دەوێت نایەویت سەرمای ببێ.***

***(ئافرەتێکی تردەستی بەناوچەوانیەوە گرتبوو ودەستێکی تریشی کردوە بەکۆڵەکەی سکی قورسی چەند مانگەییەوە )***

***- ئەو ئافرەتە سکی پڕەو باوکی منداڵەکی دیارنیە دەبێت بەتەنیا ئەرکی پەروەردەکردنی بکشێشێ.***

***(ئافرەتێکی ترسکی بەرز نەبۆتەوە لەهۆڵەکەدا ئۆقرە ناگرێت پەیتاپەیتا سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکات وچاوەڕێ چونە ژوورەوەی پزیشکە )***

- ئەوئافرەتە لەژەمی سێکسێکدا ڕۆژی خۆین بوونی دوا کەوتووە.کاتی ئەوەی نیە ببێ بە دایك .ڕەنگە قوتابی زانکۆ یان موچەخۆریکی موچەکەم .نەتوانی بەتەنیا ئەرکی منداڵیك وژیانی سەختی خۆی هەلگرێ .

(ئافرەتێکی تر هەردوو دەستی تێکەڵاوکردووەهەمیشە سەیری کاتژمیرەکەی دەستی دەکات )

- چاوەڕی هاتنی باوکی کۆرپەکەیتی تابەهەردووکیان هەواڵی سکپڕوونی لەپزیشکە ببیستن بەدڵخۆشیەوەوچاوەڕی منداڵە.

ئەمە خویندنەوەی ئەننا بوو بۆ دیمەنی ئەوخانمانەی لەهۆڵی چاوەڕوانیدابوون.

ناتاشا سەری لەسەری ئەننا نزیك کردەوە ووتی

- ئەوەچیتە بۆبێدەنگی لەوەی دەچێ لەئەنجامی سکپڕبوونت بترسی ؟
- نا لەئەنجامی سك پڕبوونم ناترسم
- ئەی چیە ؟
- سەیربکە هەریەکێ لەو ئافرەتانەی لێرەن ودۆزی چاوەڕوانیان جودایە یانی خاوەنی چیرۆك و هیوای چاوەڕوانی جودان.
- چۆنت زانیت؟ تۆ جادووگەری ؟
- نا جادووگەر نیم.من سایکۆلوجیتی کۆمەڵایەتیم خویندوە .
- دەزانم ئەی چی دەبینی ؟

ئەننا وینەی گشت ئافرەتاکانی بۆ ناتاشا خوێندەوە

ناوی  ئەننا خوێندرایەوە بە تەنیا چووە ژووی پزیشکەکە.

ناتاشا لەهۆڵەکەدا لەئامێزی  درکەزی  چاوەوڕوانیدابوو  لە  ڕۆحەوە ئاواتەخوازبوو ئەننا سکی پربێت وببێ بەخاوەنی کورپەیەك .

خۆشەویستی ئەلکسەندەربە کۆرپەکەی ببەخشێ

پزیشکێکی سەرسپی هەموو جەستەی میهرەبانی بوو.

چاویلکەکەی  داکەن  وچاویلکەیەکی  شوشە  ئەستوری  بۆ  خۆیندنەوە کردەچاو.

چاوەکانی ئەننا پڕبوون لەئاو دڵۆپە فرمیسکەکان بەخێرایەکی تیژڕەو ڕژانە سەر ڕوومەتی .

پزیشکەکە ڕوویکردە ئەننا ووتی :

- کچم تۆ ئەنجام نازانی بۆ چاوەکانت تەڕاییان تێزا ؟
- فرمیسکی پەشیمانیە ؟
- یان دڵخۆشی ؟ هەر کامیکیان بێ تۆ دەبێ دڵخۆش بێ دەزانی بۆ ؟

ئەننا وەڵامی نەدایەوە . تەڕای فرمیسکەکانی بەناخ دەمژی

پزیشکەکە ووتی:

- کچم دڵشادبە بوویت بەخاوەنی کۆرپەیەکی سێ هەفتەی.
- بەدڵنیاوە باوکیشی بەم هەواڵە دڵخۆش دەبێت.
- کۆرپەیەك  لەشۆخێکی  وەکی  تۆ  ببێ.دەبێت  چ  جوانیەك بەسروشت ببەخشێ؟
- چەندجوانە  کورپەیەکی  وەکی  تۆی  جوان  دەبێتە  ئەندامی نەتەوەی  رووسمان  ؟هەمیشە  ئافرەتی  روس  پیشەنگی  جوانی

ئافرەتانی جیهانن . میهربانی دایکانی رووس شۆخی کیژەکانمان دەنەخشینن .دڵنیام لەوەی دایکت دایکێکی میهرەبان بووە .بۆیە فرمیسکی خۆشی دایکایەتیت لەچاو دەتکێ .

- بۆدەگریت کچم ؟
- دەبێ دڵخۆش بیت.کۆرپەکەت لەدۆزێکی زۆر تەندروستی باشدایە ڕەنگە ئیمشەوهاوسەرەکەت جوانترین چەپکە گوڵت پێشکەش بکات.لێ دەبێت بەردەوام سەردانم بکەیت و بۆ ئەوەی باری تەندروستی کۆرپەکەت بخەینە ژێرچاودیریەوە.
- نازانم جگەردەکێشی مەی دەنوشی؟ ئەمانە گشتی بۆ کۆرپەکەت زیانە هەوڵبدە لەگرفت وئێشی دەروونی خۆت بەدووربگرە چونکە هەموو چرکەیەك لەئازارت کۆرپەکەت هەستی پێدەکات.

ئەننا سوپاسی پزیشکەکەی کردوو ژوورەکەی بەجێهیشت.

بەدووچاوی شینهەڵگەڕاوی فرمێسکاوی پڕلەجوانی.

دووئەژنۆی ماندووجەستەیەك ساخناخ لەپرسیار. مرۆڤێك پارچەیەك لەپاکی لەبەردەم ناتاشادا وەستا .

- سکم سێ هەفتەیە. باوەشیانکرد بەیەکدا . گەڕانەوە بۆ ماڵەوە .

ناتاشا کەزانی ئەننا سکی پڕە و بڕوای بەکوشتنی کۆرپەکەی نیە .پێباش بوو نهێنەیەکانی بۆ بدرکینێ

ئیواریە وشار چاوەڕوانی تاریکای شەوە.

شەو هەمیشە لەژێر باڵی تاریکیدا ملیاردەها چیرۆکی ڕۆمانسی یان تاوانی نامرۆڤیایەتی دەنووسیتەوە.

ئیمشەو لە کۆلانێکی کۆنی هەژراندا.لەنێو ئامێزی شوینژینی دوو ئافرەتی قوربانی داماودا.

چیرۆکی تراجیدیای دوو عاشقی جوان وپاك وناكام دەخویندریتەوە.

سەرتای دراماییەکی مرۆی ورۆلی خانمێکی هوشیاردەنوسرێتەوە.

ترسی سەرما مرۆڤە پێادەڕەوەکانی شەقامەکانی لەبەرگی ئەستوردا پێچاوەتەوە.

عاشقەکانی شەقامەکان باوەشی گەرمی عەشق وجەستەیانکردوە بەیەکدا.

پەلەوەرەکانی نێوئامێزی گەلاتەزیوەکانی درەختی ملوانکەی شەقامەکان وێلی کونجێکی گەرمن تا رۆژ هەڵدی وکەمێك گەرمایی دەدا بەزەوی و خۆیان لەسەرمای تەزیوی شەوبپارێزن.

بێلانەکانی شەقامەکان لەسوچە تاریکەکانی شاردا سەری خۆیانیان لە ژێرپالاتی کۆندا حەشارداوە چاوەڕی تیشکی گەرمی رۆژی گەرمی سبەی دەکەن.

عاشقە تەنیا دەروون ساردەکان کەی دەگەنە ژوانی گەرمی وەفاو باوەشێکی پڕماچی پەشیمانی تورەبوونێکی گەنجی .

بێکار برسیەکانی شار خەمی ژەمی خواردنی گەرمی سبەینیانە .

کەی دەبێ ببن بەکریکار و تا بە برسیتی شەوانە سەرنەکەنە سەر سەرین.

منداڵە هەژارەکان هێندە زۆرن وولاتێك پیویستە خزمەتیان بکات ئەوان برسی .

***چەن ئافرەتی شوخی بێکار سەرمای سروشت و رۆح لەبارەکاندا رۆح وجەستەیانی بەسەهۆڵ کردوە لە چاوەڕوانی کڕیارێکی جەستەی ناسك لە بێوژدانێکی مافیای خاوەن پارە.***

***ئەمانە مێژووی شەوێکی شار دەنووسیتەوە کەسیش نووسەری نیە.***

***کەسیش نازانی کێ ئەم ڕاستیانە دەخوێنیتەوە.***

***مێژووی مرۆڤایەتی پڕە لە خۆین وفرمێسك.***

***قوربانیەکان مرۆڤن و تاونباران مرۆڤی دەرون ئاژەڵی خاون دەسەڵاتی سیاسی و کەپیتال.***

***ئەننا و ناتاشا بەبێدەنگی سەیری تەلەفزیون دەکەن وهیچیان ئاگایان لەچیرۆکی فلیمەکەش نیە , هەریەکەیان لەیەکاڵاکردنەوەی گرفتەکانی خۆیانن . ئەننا دەیزانی درکاندنی نهێنیەکانی دەروونی ناتاشا بەزۆر نابێت و کاتێك دێ ناتاشا باری قورسی پاراستنی نەهێنیەکان لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە ودەیدرکینێ.***

***ناتاشا کەزانی ئەننا بۆتە دایك و کەسێکی بەهێزە و بڕیاریدەرێکی ڕادیکاڵە.ترسی درکاندنی نهێنیەکانی نەما.***

***- ئیمشەو نهێنیەکان دەدرکینێم . تا ئەننا نەخشەیەکی نۆی بۆژیانی بکێشێ.***

***- چاوەڕوانکردنی ئەلکسەندەرێکی کوژراو تاوانە بەرامبەر بە ئایندەی هاورێکەم. ناتاشا لەتەك رۆحی خۆیدا ووتی***

***وەك خۆی بۆگوژمێك ئامادەبکات شێوەی دانیشتنەکەی گۆڕی و ڕوویکردە ئەننا .***

- ئەننا ئێمە سێ هەفتەیە چاوەڕی هەواڵێکن بزانینن سکت پڕە یان نا ؟ ئیستا زانیمان.چاوەڕوانیەکەت کوتای هات .

- ئیستا چێدەکەیت ؟

- چاوەڕی چیت ؟

- زۆردەمێکە چاوەڕی هەواڵێکم تۆ گزیم لێدەکەیت .

بۆ نهێنەکانم وەك پزیشکەکەی ئیمرۆ پێنالێت و تامنیش بتوانم نەخشەیەکی ئاینده بکێشم؟

- نهێنی چی ؟

- من و تۆ لەسەردەمی قوتابخانەی سەرەتایەوە هاوڕێین .دەکرێ لە من نەگەیت ؟بۆ ڕاستی ئەلکسەندەرم پێنالًیت؟

بەگریانەوە باوەشی بە ئەننادا کرد لێم ببورە درۆم لەتکدا نەکردویت شاردنەوەی نهێنیەکەش بەشێکە لەخۆشەویستیم بۆ تۆ.

ئەننا بەهێمنیەوە

- ئەنجام هەر شێوەیەك بێ من پەسەندمە.چونکە ناتوانم ئەنجام بگۆڕم . بەدڵنیایەوە ئەوەی بەسەرمن و تودا هات ویستی ئێمە نەبوو ئەوەشی بەسەرئەلکسەندەردا هاتووە ویستی ئەونەبووە.

- ئەمە چارەنووسمە . ویستی من نەبوو لەئەلکسەندەر زیاتر پێاویکی تر ببێ بە باوکی منداڵەکانم . ئیستا سەرسەریەك باوکی کورپەکەمەوە پەسندی دەکەم و کۆرپەکەشم بەجوانی پەردوەردەدەکەم . چیرۆکی ئەلکسەندەریش هەرچونی بێ من ناتوانم بیگۆڕم .

ئێمڕۆ بێ یان سبەینی ساڵێکی تر. تۆش نەیدرکینێ . ئەو چیرۆکە ئاشکرا دەبێت . ئەوەی کۆمەك بەمن دەکات زوو درکاندنیتی چۆنکە کەهیوام بە ئەلکسەندەر نەما پیویستە هیوای نۆی لەژیانمدا سەوزبکەم . ئەمە ڕاسپاردە وئاموژگاری دایکمە(ژیانی مرۆڤ لەنێوان ڕابوردوو و ئایندەدایە . لەڕابوردوو مەترسە . ئایندە مسۆگەربکە) تۆچۆن لە بێوەفای هاوڕێکەت تێگەیشتیت و ئیستا ئەو ژیانی خۆی و هاوڕێ کچی تری هەیە.منیش وەك تۆئەگەر ئافرەتێکی تری لەژیانی ئەلکسەندەردا هەیە وخۆی پەسەندی دەکات وبەختیارە پیرۆزی بێت.خۆشەویستی نێوان دوو جەستە دوو و دوو ڕۆح کاتێك جوانەکە هەر دوولا یەکتری پەسەندبکەن.

ئەلکسەندەریش مرۆڤە ڕەنگە بەرژەوەندی و ئایندەی لەتەك ئافرەتێکی تردابێ لەمن باشتر .

ناتاشا :چاوەکانی پڕبوون لەبەزی وخۆشەویستی دەستەکانی ئەننای گووشی ووتی:

- نا. نا . ئەننا ئەلکسەندەر گەنجێکی زۆر بەوەفا وتۆی زۆر خۆشدەویست ..

ئەننا کە ووشە ڕابووردوی(تۆی زۆرخۆشدەویست)بیست تێگەیشت ئەلکسەندەر لەژیاندا نەماوە

هەناسەی ئەننا بۆ ساتێکی کەم وەستا . ووشەی لەسەر زار نەما ناتاشا سەری خستەنێوان دەستەکانیە وقوڵپی گریانەکەی کپکرد.

ئەننا لاوازبوو پشتی بە قەنەفەکدادا.

***دەستێکی بەچاوەکانیەوە گرت دەستێکی لەسەرسکی دانا.***

***دەستێك بۆکۆتای چیرۆکیکی تاریکی ئەلکسەندەر.***

***دەستیك بۆ کۆرپەیەکی چاوەڕوان.***

***بێدەنگیە فرمیسکاویکەیان گریانێکی کپکراوبوو.***

***زمانی هەردووکیانی لەپرسیار و وەڵام گریدابوو.***

- ***ئیستا پێمبڵی کارەساتەکە چۆن بووە ؟***
- ***چۆن کوژرا ؟***
- ***بۆ کوژرا ؟ کێ کوشتی ؟***

***ناتاشا : ووتی:***

- ***کە هاتینە ناوشاری سان پیترسبۆرگ.***

***ئێمە سەرگەرمی کارپەیداکردن بووین. سێرگی ناسیاوێکی هەبوو پەیوەندی پێوەکرد بۆ ئەوەی کارێکمان بۆ پەیدا بکات.***

***بڕیارماندا بوو لەیەك دانەبڕین وکۆمەکی یەکتری بەکەین . من ئەو کارەم دەستکەوت . کۆمەکی ئەلکسەندەر و سیرگیم بۆ ماوەیەك کرد . هەردووکیان ئەودالی کارپەیداکردن بوون ئەلکسەندەر زۆر خەمی بوو هەمیشە دەیگوت ئەننا چاوەڕیمە.***

***زۆر پەلەی بوو ژیانێك پێکەوە بنی وبێت بەشوینتا .***

***شەو ڕۆژ لە هەڵپەدابوو . پاشماوەیەك سیرگی ئافرەتێکی ناسی و لەتەکیداچوو بۆ مۆسکۆ . منی بەتەنیا بەجێهیشت .***

***ئەلکسەندەر برایەکی باش بوو دڵخۆشی ئەدامەوە . دەیووت لەماوەیەکی کەمدا ئەننا دێت و بەتەنها نابێت.***

***چەند ڕۆژێك ئەلكسەندەر دیارنەما.***

***تەلەفوونی بۆکردم ووتی کارێکی باشم دەستکەوتووە . دوو هەفتەم پێدەچێ کە گەڕامەوە پەیوەندیت پێوەدەکەم.***

***دوای سێ هەفتە مانگی زیاتری پیچوو . گەڕایەوە وکوڕێکی گەنجی قۆزیی لەتەکدابوو وناوی میخائیل بوو.***

***زۆر کەیفی خۆشبوو . مستێ دۆلاری پێبوو . ووتی هەفتەی داهاتوو دەڕۆم بۆ شارێکی دوور نازانم چەندم پێدەچێ.***

***دوو سەد دۆلاری دامی و نامەیەکی بۆ تۆ نووسی . چونکە دەیزانی منیش دەمەویت بگەڕیمەوە بۆ ماڵی باوکم .***

***وادیاربوو شۆینی کارەکەی دووربوو تەنیا بەتەلەفون پەیوەندیمان هەبوو . لە دوا تەلەفووندا ووتی :***

***کە گەڕامەوە دەچم بەشوێن ئەننادا .***

***دەیگوت تا نەبم بەخاوەنی پارەیەکی باش ناگەڕیمەوە کارەکەم باشەو پارەیەکی باشی تێدایە دەمویت کە ئەننا هات بۆ سان پیترسبورگ بچیتە شوینترینێکەوە لە هیچی کەم نەبێت .***

***من بە بۆنی هەناسە ودیمەنی ڕۆحی ئەننا دەژیم ڕاستە کاتێك عاشقەکان لەیەك دووربن عەشقیان زیاتر و جوانتر و پاکتر دەبێ ئیستا دەزانم ئەننا چ خانمێکی پاك و شەیدایەکی بەئەمەکە.***

***ئەگەر تەلەفوونی کرد پێبڵی چاوەڕیم بکات.***

***من ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی تەلەفوون و گەڕانەوەی ئەلکسەندەربووم .***

***هیچ دەنگ ورەنگی نەبوو.***

***درۆم نەکرد بێ چەند مانگیکی پیچوو ڕۆژێك میخائیل هاوارێکەی ئەلکسەندەرهات بۆ لام.***

***زۆر داماو خەفتباربوو ڕیشهاتوو و کەمێك دەشەلا و زۆر ترساو دەهاتە بەرچاو وەك منداڵێکی برسی چۆن باوەش بە دایکیدا بکات . ئاوا باوەشی پێداکردم دایە قوڵپەی گریان.گریانێکی دڵسۆزانە و هاوڕیانە بۆ کارەساتێك کە من نەمدەزانی چیبووە.***

***لەگریانە بەکوڵەکە و باوەشە بەسۆزەکەی میخائیل منیش خۆم پێنەگیرا و لەتەکیدا کەوتمە گریان .***

***ناتاشا بێدەنگ بوو ئەننا بەتیلەی چاوەکانی دەیڕوانیە ناتاشا.***

***ناتاشا لە تاو ئازار و تراجدیای بە سەرهاتەکە نەیدەزانی چۆن چیرۆکەکەی بۆ ئەننا بگێڕیتەوە.***

***سەریداخستبوو زوو زوو زمانی بەلێوەکانیدا دەهانی و پەردەیەك لەفرمێسك و وێنەکانی بەرچاوی لێڵکردبوو.***

***سەری بەرزکردەوە ڕوانیە تیلەی چاوە چاوەڕوانەکانی ئەننا .***

***ووتی :***

***میخائیل کوڕێکی زۆرباش وجوان وداماوبوو لەتاو بێکاری هەموو کارێکی دەکرد . بەڕێکەوت لەتەك ئەلکسەندەردا لەوکارەدا بوون بەهاوڕێ. لێ چونکە هەردووکیان هاوتەمەن وهاو هیوابوون.***

***زوویەکتیران خۆشویست یەکتریان وەك هاوڕێ پەسەندکرد.***

***میخائیل بۆیگێڕامەوە .***

## شەو درەنگەو

ئاسمان تەلخ و هەورەکان ژانی بارانێکیان گرتبوە ئامێز . تك تك  نمە باران دەبارێ .

تاریکای ئاسمان تیشکی حەزی چاوی گەشی گشت ئەستیرەکانی کوشتبووە .

بەرگەکانی بەریان تەنك.

سەرما باوەشی بەجستەیاندا کردوە.

خانویەکی کۆن و هۆڵێکی تەختەی داروخاوی گەورە کەوتبووە نێو دارستانێکی چڕی ترسناکی دەرەوی شار.

دوو لۆرێ لە تاریکێکەدا وەستابوون.

چەند پێاوێکی پاڵتۆ لەبەری سەرتاپا ڕەش لە سوچێکدا پێکەوە دەدوان و مژیان لەجگەرەکانیان دەدا کەس گووی لە ووتەکانیان نەبوو تەنیا لەدوورەوە بە هەڵمژینی دووکەڵی ناخی توتنی جگەرەکان پریسکەی ئاگری جگەرەکانیان گەژدەبووە .

ئەلکسەندر و میخائیل یش لەچاوەڕوانی شتێکی نامۆدابوون .

لەترساندا بە چرپە لە تەك یەکتریدا دەدوان.

چاوەڕی کارێك بوون نە یاندەزانی شێوەی کارەکەیان چیە .

تەنیا دەنگی شنەی باو و باوەشینی لەنجەی درختەکان وسرپەی گیاندارە کێویەکانی نێودارستانە چڕە تاریکەکە دەبیسترا.

چاوەڕوانییەکی سامناك بوو. نهێنیەك تەنیا ئەلکسەندەر و میخائیل پیان نەدەزانی .چاوەڕوان بوون.

لەتاریکای و وقوڵای ڕێگە قووڕاوییەکەی نێو دارستانەکەوە وەك چاوی بزی هەژدیهایەکی ترسناك ڕووناکی لایتی ئۆتۆمبێلیك دەرکەوت.

پیاوەکانی نێو حەوشەکە کەوتنە جوڵە و جگەرەکانیان کوژاندەوە .

وەك کۆمەڵە سەربازێك چاوەڕی هاتنی ئەفسەرێك بکەن ڕاچڵەکین.

ئۆتۆمبیلێکی مارسدیسی ڕەش لە نیوەڕاستی حەوشەکەدا وەستا وپیاوەکان بەخێرای چوونە نزیکیەوە و دەرگاکەیان کردوە .

پیاوێکی باڵابەرزی کەتەی ورگزل دابەزی پاڵتۆیەکی چەرم و بەو شەوە چاویلکەیەکی ڕەشی لەچاوکردبوو.

ژمارەی ئۆتۆمبیلەکە بە قورسۆاخدرابوو.

بەپەنجە ئەلکسەندەر ومیخائیلی بانگکرد .

نزیك پیاوەکەبوونەوە .

سەیرکی قەد و باڵا و تەمەنیانی مەزەنەکرد و ووتی :

- باشە گەنجن وتوانای کاری باشتان هەیە.ئەو کارەی پێتان دەسپێردرێ ئاماژەی بە دوو پیاوەکرد . لەتەك ئەم دوو پیاوەدا بەئامانجی دەگەینن . هەر ئیمشەودەکەونە ڕێ . ئەوان شارەزان ئێوە گۆیان لێدەگرن , بەشەو دەڕۆن وبەرۆژ پشوودەدەن , هەموو مانگی یەکی

1000 دۆلار موچەتانە خەمی خواردن وجل وبەرگیشتان نەبێ. بێگومان هەموو کاریکی باش بەخشیشی باشی هەیە . ئاورِی لە پیاوەکاندایەوە.

پێشیان کەوت دەرگای هۆڵێکی گەورەی تەختەی کۆنیان ترازان .

رِووی گلۆپی مارسیدسەکەیان لەهۆڵەکە کردە پیاوەکە بەلایتێکی شەوقفراوانەوە پێشیان کەوت . هۆڵەکە پرِبوو لە سندوقی پێچراوەی رەنگ سەوز.

ئاماژەی بەگۆیزانەوەی سندوقەکان بۆ ناو لۆریەکان کرد. .سندوقەکان قورس وگران توکمە پێچراوە.

جەستەیان کەوتە سەرئاوێکی گەرم .

ساردی نێو دارستانەکەیان لەجەستەدانەما . نەئەلکسەندەر نە میخائیل نەیادەویرا پرسیار لەناوەرِۆکی سندوقەکان بکەن لێ بەقورسایەکەیی و رِەنگی سەوزی سەربازی ئاشکرابوو گشتی تەقەمەنی و کلاشینکۆف وگوللەی ئاربیجی بوو.

لورێکانیان پرکرد . ئەلکسەندەر و میخائیل بەئاستەم فریای هەناسەدان دەکەوتن.

چوونە بەردەمی پیاوە کەتەکە . چاوەرِێ دوا ووتەی بوون.

رِویکردە ئەلکسەندەر و میخائیل.

- ئەرکی ئێوە گەیاندنی ئەم بارانەیە بەشۆێنێك ولەویشەوە نەخشەی کاری تردان هەیە . ئاماژە بە دوو پیاوەکی تەنیشتیان کردوو ووتی :

- بێ ئەم دووانە هێچ بڕیارێك و ڕویشتنێك نادەن .وەکی ووتم.مانگانە پارەی خۆتان وبەخشیش دەبێ ئەگەر کارتانباش بێت.

ئەمەی ووت سوار مارسیدسکەبوو . ڕۆیشت.

ئەلکسەندەر و میخائیل و دوو پیاوی نامۆ دوولۆری پڕلە تەقەمەنی مانەوە.

بوون بە هاوسەفەر و کەوتنە گفتوگۆ.دابەشبوون ئەلکسەندەر لەتك پیاویکدا سواری لۆریك بوو.

میخائیل لەتەك پیاوەکەی تردا.

چونکە باری لۆریەکان قورس و ڕێگەی نێو دارستانەکش ڕێگەیەکی خۆڵی بووبەهیواشی دەرویشتن.

بێدەنگیەکی پڕ پرسیار لە نێوان ئەلسکەندەر و پیاوەکەی تەنیشتیەوە دروستبوو.

ئەلکسەندەر ڕوانیەی لای چەپەوە کلاشینکۆفیك دانرابوو . تێگەیشت کارەکەیان ترسناکە . هیچ جۆرە چارە و بڕیارێکی تری نیە تەنیا دەبێت ئەم کارە بکات.

لە هەموو چرکەیەکدا هیواکانی بەخۆشەویستی ئەننا دەسپارد.

ماندووی بارکردنی سندوقەکان ولەنجەی ئۆتۆمبیلەکە بوون بە بێشکەیەك جەستەی ماندووی ئەلکسەندەریان ڕادەژن.

پێڵوەکانی چاویی کەمێك قورسبوون . کەوتە وە نەوزدان.

ملی خاوبوو وە .

خەوی لێکەوت . خەوێکی پر ترس و پچڕپچڕ.

شۆفیرکە پێخۆشبوو ئەلکسەندەر خەوی لێکەوت . تا شارەزای ڕێگەکە نەبێت ئاوڕێکی لەئەلکسەندەری خەوتوو دایەوە .

زەردەخەنەیەك گرتی بێ ووشە ووتی:

- ئەرکی تۆ لە لێخورینی ئەم لوریە گرانترە .

تا تارێکی شەوەکە ڕەشتربوایە ڕویشتنی لۆریکان لەبارتربوو.

دوای چەند کاتژێرێ جوڵەی لۆریەکە خاوبووە.

ئەلکسەندەر لەخەوەکەی بەئاگا هاتەوە.

لەنجەی لۆرێکە خاو و رۆیشتنەکەی بێ ڕاژەنین بوو . فلچەی پەنجەرەی ئۆتۆمۆبێلەکە نمە بارانەکانی ڕوی ڕادەماڵی . بینی لەسەر سەرجادەی قیرن و دارستانەکەیان جێهیشتوە . سەیری ئەم لاولای خۆیکرد لەتریکای زیاتر هیچی نەبینی .ویستی چەند پرسیاریکی لادروست بوو نەیدەوێرا پرسیاری شوێنکە لەشۆفیرکە بکات.

تەنیا سەیری بێدەنگی یەکتریان دەکرد.

شۆفیرەکە بە گاڵتە ئامێزەوە ووتی :

- خەوێکی خۆشت کرد....خەوت نەبینی ؟

- خراپ نەبوو....کەمێك برسیتی گەدەی ختوکەداوەم کەی؟ چۆن ؟ لە کوێ بتوانین خواردنێك پەیدابکەین ؟

- خواردن و خواردنەوە گشتی ئامادەیە لێ کات مۆڵەت نادا .

- بۆ ناتوانین نێو کاتژمێر مۆڵەت لە قەراغی شەقامەکە وەرگرین؟

***- ماوتە لە ئەرکەکەت بگەیت...تۆ نازانێت ئێمە چێما پێیەوە لە کۆین بۆ کۆێ دەچین ؟ دەبێت چەند جارێك ئەم کارە بکەیت ئەوساتە ڕاستیەکان دەزانی منیش لەسەرتادا وەك تۆ نامۆ بووم .***

***چ دەکەیت پیاو کەخێزان و دوو منداڵی هەبوو ئەرکێتی بۆ پاراستنی خێزانەکەی لە پرسیتی گشت کارێك بکات.***

***- تۆ پیشەیەکی ترت نیە . نەبووە ؟***

***- پیشەی پێشینەم من ئەفسەری سوپا بووم ..دەرکرام و ئیستا بێکارم و ژنێك ودوو منداڵم هەیە .***

***- ئەی تۆ خێزانت هەیە؟***

***- نا خۆشەویستێکم هەیە نیازمان وایە زەماوەند بکەین.***

***- ئەی بۆ نایکەن ؟***

***- لە بێکاری و بێ پارەی و بێ خانووی چۆن زەماوند دەکرێ ؟***

***شۆفیرەکە بێدەنگ بوو .***

***ئەلکسەندەر کەوتە ووردکردنەوەی کارەکە . دەبێ چ هونەرێکی تێدابێ لەتەنیشت کۆنە ئەفسەرێکی چەکدار دابنیشیت و لۆرێکی پڕبقە بەرەوە ئامانجێکی نادیار بەرن؟***

***بێدەنگیەکەی پسان و ڕوویکردە شۆفیرەکە***

***- دەمەوێت چەند پرسیاریکت لێبکەم .***

***شۆڤیرەکە بە چاو وەڵامی ڕەزامەندی دایەوە .***

***- لەسەرتادا ترسم زۆر لەتوو هەبوو.لێ کە ووتت ژنێك و دوومنداڵت هەیە و لەپێناویاندا ئەم کارە دەکەیت هەستدەکەم***

من وتۆ خاوەنی یەك گرفت و یەك جۆر خۆشەویستی بین ناچاربین کارێك بکەین کە نەمانەویت بیکەین , من نازنم ئەرکی من رۆڵی من لەم بازارەدا چیە؟

- تۆ بێ من دەتوانی ئەم ماشینە لێبخوریت بۆچی منت لەتکدابێت؟

ئەفسەرەکە تیلەچاوێکی میهربانی تێگرت و ووتی:

- دەکرێ لەمەبەستەکانەوە نزیك بین لێ لە ئەرکەکانمانەوە زۆر جیاوازین .

- چۆن ؟ مەبەستت چییە؟دەمێکە ئەم کارە دەکەیت ؟

- مەبەستمان مسۆگەرکردنی بژیوی ژیانە کە هەردووکمان هاوبەشین لێ لەئەرکدا جوداین . بۆ پرسیارەکەت من ماوەی ساڵێك زیاترە ئەم کارە دەکەم . هەر بەم کارە توانیم دوو ژوور بۆ خێزانەکەم بکڕم. بەڵام دڵنیابە ئەمە کاری من نیە . خۆم دەزانم چیدەکەم . بەهیوای ئەوەی تۆش بتوانی ژیانت باش بێت.

- هەموو هیوای من ئەو ژوورە ڕووتەیە لەتەك ئەنندا لەباوشمان بگریت هێندەم خۆشدەویت ئامادەم بۆ بەختیاری ئەو گشت شتێك بکەم.

وورده وورده سنگی ئاسمان ڕووناکی دەنوان . شۆفیرەکە سەیری کاتژمیرەکەی دەستیکرد . لەئاوینەی ئۆتۆمۆبلیەکەوە ڕوانیە شەقامەکە . پاش کەمێك لە شەقامە قیرەك لایدا و لۆریکەی خستە

سەرجادەیەکی گڵینە وملۆانکەی درێژی جادەکە لەگەردنی دارستانێکی چڕدا لۆریکانی کردە مەدالیای سنگی.

هەرچواریان دەبەزین بازییان بەباڵەکانیان کرد ووزەیەکیان دابەجەستەیان ئاگریکیان کردەوە . لەسندوقیکدا تەواوی خواردن وخواردنەوەی تێدابوو . لەدەوری ئاگرەکە کۆبوونەوە بە دەم نانخواردنەوە ترس ئامێز لەتەك یەکدا کەوتنە دووان.

ئاشنایەتیەکی تەنك هەرچوارپانی لەباوەش گرت.

ئەلکسەندەر و میخائیل یەك پرسیاریان هەبوولێ هیچیان توانای کردنی نەبوو.

تەنیا چاوەکانیان نهێنیەکانی دەگوزیایەوە . شۆفیرەکەی تەك ئەلکسەندەر لەسەر ڕەمتی سەربازی ڕوویتیکردن ووتی:

- دەبێ بزانن هەرچوارمان پیوسیتمان بەخەو هەیە . بەسەرە دەنووین ئیستا ئێوە دەنوون ومن ئەلکسەندەر پاسەوانین .

دارستانە کە هێندە چڕبوو هەر باڵنەکان دەیانتوانی هیلانەی خۆیان بدۆزنەوە .

پاڵی دابوو بەدارێکەوە کڵاشینکۆفەکەی لەباوەشکردبوو هەر چەندە چاوەکانی نوقاندبوو لێ جوڵەی گلێەنکانی ژێر پیڵوەکانی بەئەلکسەندەری گەیاندا خەوتوویەکی دڵ ووریایە.

بەچۆاردەوری خۆیدا ڕوانی تەنیا درختی باڵابەرزی جەستەتەڕەی دەبینی.لەدەنگی لەنجەی گەڵای درخەتەکان و وورتە و سرپەی کرم وباڵندەکان ودەنگی هەناسەی خۆی نەبێت هیچی تری نەدەبیست.

کەمێك یاری بەپەنجەكانی وملی كرد . حەزی دەكرد سەرخەوێك بشكێنی و نەدەوێرا چونكە لەسەرەتادا پێوترابوو دەبێ بەئاگابێ و سەرەیی نووستنی دوای تەواوبوونی نووستنی میخائیل وشۆفیرەكەی تره.

بوو بەسەربازێكی بێ بەرگی سەربازی گۆێراپەڵی شوفیرەكە.

وێنەیەكی لەباخەڵی دەرهانی چەند ساڵێكی ڕابووردووی هانیەوە پێشچاوی رۆحی .

لەسەیرانێكدا لەتەك كۆمەڵی هاوڕیی نزیك زییەكی بچوكی دێكەیان خەریكی گۆشتبرژاندن وگیرانەوەی نوكتە و سەماببون.

ئەننای لەباوشدابوو.

لەناو وێنەكەدا دەنگی ئەننا و پێكەنین ونوكتەكانی هاوڕێ و بۆنی گۆشتبرژاندن وقۆدگا دەكرد و دەنگی بەزمی كۆڕ و ژیانە سادەكەی دێكەیانی لە ڕۆحەوە دەبیست.

ئەو كاتە مەستی ژیانێكی سادەی دیێەكی داماوی سروشتی جوانی رووسی بوون نەیدەزانی زەمەن خیرا دەگۆڕێ و لە ئەننا دادەبڕێ.
تاماوەی دابڕاندیان فرەبوایە تاسەی ئەننای لە رۆحیا تۆخ ولەدڵێدا شەیدادەكرد . پەشیمان بوو لەو شەوەی لە بارەكەدا سەرنجی بۆ بوونی نەبوو.

وەك پەشیمانی خۆی پشواتەوە دەستێكی بەناو چوانیدا هانی وپەنجەكانی بەنێو تووكەكانی سەریداخشان بێخی سەری

بەنینۆکەکانی کێڵا لە ئامێزی دارستانێکی چڕو لەنێوان دوو لۆری پڕلە تەقەمەنی و کلاشینکۆف و گوولەی ئاربیجی.

دووکەسی نامۆ و ئامانجێکی تاریك.

هیوایەکی داخراو تاسەیەکی زۆری ئەننای خۆشەویستی .

تەواو خانەکانی مێشکی گرمۆڵەی کۆمەڵە پرسیارێك بوون.

کە دەگیشتە سنوری پرسیارە ترسناکەکان . لەدورەوە تیشکی شینی چاوی ئەننا رێگەی هیواکانی ڕووناك دەکردەوە .

لەنێوان درزی گەڵای قەدی درختەکانەوە ڕوانیە بۆشایی ئاسمان دەنگێك رژایە خانە ماندوەکانی مێشکیەوە .

دەنگی ناسکی خۆا بەئەلکسەندەری ووت .

- ئەلکسەندەر ئەننا چاوەڕیتە.

ڕاچڵەکی و بەپرتاو هەستایەسەرپێ. سەیرێکی درختەکانی کرد وەك پرسیاریان لێیبکات.

- درختەکان ئێوەش دەنگی خواتان بیست کە باسی ئەننا دەکات؟

شۆفیرەکە چاویکردەوە ڕوانیە ئەلکسەندەر پەشۆکاوە.

وێنەیەکی بەدەستەوەیە ووتی :

- لە چ غەمێکدا گرمۆڵەبویت و ئارەزووی پشووت نیە

- دەتوانم ئەو وێنەیە ببینم ؟

ئەلکسەندەر ناخێکی پەشۆکاو هەستێکی تورە زمانی لەگۆخستبوو . وێنەکەی دایە دەست شۆفیرەکە .

***ئەننا خانمێکی شۆخی چاوشین وپرچ خورمای روسی ڕەسەنی دیهاتی لەباوەشی ئەلکسەندەردا ڕاکشابوو زەردەخەنەکانی بەچاوی کامیراکە بۆ ئەم رۆژە بەخشی بوو.***

***شوفێرەکە هەناسەیەکی هەڵکیشاو و ڕویکردە ئەلکسەندەر و قۆناغی کلاشینکۆفەکەی کرد بەگۆچان وهەستایە سەرپێ .***

***- با پیاسەیەك بکەین.***

***لەنێو توولە ڕێگەی چڕە درختەکان پێاسەیاندەکرد.***

***شۆفیرەکە ووتی :***

***- سەرتای هەموو چیرۆکێ . ڕۆمانی . میژوویەك حیکایەتێ عاشقێ . هۆنراویەك , نەخشەیەکی سەربازی گشت بوونەکان بەیەك ووشە دەستپێدەکات .***

***ئەلکسەندەر هەستیکرد ئەم شۆفیرە کەسێکی هوشیار و خاوەن تاقیکردنەوەیەکی جوانە ووتی :***

***- وایە***

***- تائیستا تۆ نازانی من ناوم چیە؟***

***- وایە***

***- بۆپرسیارت نەکرت ناوم چیە؟***

***- ئەدمۆسفیرەکەی سەرتا هێندە ترسناك بوو نەك نەمدەوێرا پرسیار لەناوت بکەم بەڵکوو سنورێکم بۆ هەناسەدانی خۆشم کێشابوو.***

***- ئەم ترسە بۆ؟***

- چونکە چاوەڕی ژیانێکی خۆش بۆ خۆم و ئەنناى خۆشەویستم دەکەم . ئەم دونیایە بۆمن گشتی نامۆیە . نۆیە کاتم دەوێت تا لێتێبگەم

- چارەنووسی مرۆڤەکان بەدەستی خۆیان نیە.

مرۆڤەکان نە چارەنووسیان هەڵدەبژێرن نەمێژوویان بەئارەزووی خۆیان دەنووسنەوە ئەوە ڕووداوەکانی ژیانە دەبن بەمێژوو و چارەنووس دەسنیشان دەکەن.

من دەمەوێت سەرتا دەرگای ژوورێکت بۆبکەمەوە لەو ژوورە پڕ پرسیارەدا ترست نەبێ.

- ئەویش دەرگای ئاشنایەتیمانە . بڕوانە ئیستا من تۆ بە ئاگا و هاوریکانمان نوستوون , ئەوەی دەبینی کۆمەڵی درەختی باڵا بەرز و چڕ . نەدەنگ نەسرپەی مرۆڤێ نابیستی لەم چۆڵەوانیە پڕ ترسەدا من هەرچیەك بم تۆ هەرچیەك بیت ژیان ئێمەی کرد بە هاوڕێ.

من کلاشینکۆفێکی پڕ فیشەکەم پێە. ئەگەر ئیستا مارێك بەنهینی هێرشی کردە سەر من و منی زەهراوی کرد.

ئەوە کلاشینکۆفەکەم کۆمەکم پێناکات تەنیا تۆ نەبیت , دەکرێ بتوانم مارەکە بکوژم.لێ ناتوانم ترسی زەهری مارەکە لەجەستەم پاکبکەمەوە بەبێ یارمەتی تۆ. کەواتە با کاتی ناسینمان کەم بێت وەك دوو مرۆڤ یەکتری پەسەند بکەین. تۆ چاوەڕی خانمێکی کەناوی ئەننایە لە وێنەکدا هەموو جوانیەکی رۆح لە پرشنگی چاوەکانەیەوە دەبارێ.

- ئەو پیاوە بەختەوەرە کە خێزانێکی خۆشەویست و بەڕێزی هەبێ.ماوەیەکە ئەم کارەدەکەم بێزی لێدەکەمەوە چونکە دەزانم من بەنزین بە ئاگریکدا دەکەم کە تەنیا مرۆڤە داماوەکان منداڵە بێتاوانەکان ئافرەتە بێمافەکان تێدا دەستووین.

تا ئەوساتەی بەخێزانەکەم عاشق نەبووم نەمدەزانی ژیان جوانی تێدایە . ئەوە خۆشەویستی خێزانەکەمە جوانی ژیانی نیشاندام.

ئەوە عەشقی دایکی منداڵەکانمە جوانی گشت ژیانمی پێبەخشیوم.

بۆیە بڕیامداوە لەپێناوی ئەو خۆشەویستیەدا ژیانم بخمە بەر شەپۆلی تورەترین ڕەزیکۆوە.دەکرێ بۆچونەکانم خۆپەرستی پێوەدیاربێ ئێ کاتێك من دەتوانم باسی خۆشەویستی بکەم کەپێش گشت شتی خۆشەویستی خۆمم لامەبەست بێ کە پیشکەشمکردوە بە هاوسەرە ودووکورپەکەم .

- من ئەفسەری سوپا بووم چیرۆکی زۆرم بیستوە ودیوە و زۆر گەنجی وەکی تۆ سەربازی من بوون . زۆرهیوای سوتاوم بینی . ئەمانە جوان نین لێ بەشێکن لەو چارەنوسەی کەمرۆڤەکان حەزی لێناکەن.

ئەوەی مرۆڤ لە چارەنووسی ناشیرن دەپارێزی هوشیاریە تێگەیشتنە . ئا دوا تەواوبوونی ووتەکانم ڕەخنەیەکت لەنێوان ئەم کارەی من دەیکەم ئەو ووتانەی من دەیڵێم هەبێ . لێ ئەمەش فاکتی خۆی هەیە . ئەویش ژیانێك بۆ خیزیانەکەم و ئایندەیەکی جوان بۆدوو منداڵەکەم .

- ئەمە کاری من نیە. تۆ تائیستا نازانیت ئەرکی تۆ چیە؟

- بۆ لەتەك منداێت؟

- بۆ بوویت بە هاوسەفەریك و هەموو مانگی 1000 دۆلار وەردەگریت ؟ ئەو پاریە زۆر زۆرە . من دەزانم پیویستت بەپارە هەیە لێ لەهەموو هەنگاویکدا وریابە چونکە کەسێك هیوای بەگەڕانەوەی تۆ هەیە . ئەویش ئەننایە.پەیداکردنی پارە لەم ساتە ئالۆسکاوەی وولاتەکەماندا وەك پارویەك لەدەمی شێر دەربهێنی وایە.

- گەرهوشیار و چالاك نەبیت شێرکە نەك دەستی پارەکەت دەخوات بەنینیۆکی تیژی گشت جەستەت خەڵتانی خوێن دەکات .

ئەم قسانەی دەکردوو ئەلکسەندەر بێدەنگی کردبووە سابیتیك گشت ووشەکانی تێدا کۆکربووە . دەیرِوانیە بەرپی خۆ . لەناکاو شوفیرەکە لە قسەکردن و ڕویشتن وەستا وئەلکسەندەر لەزەویکەی دەڕوانی وبەدەم بیرکردنەوە چەند هەنگاوێك لەشوفیرەکە دورکەوتەوە.

هەڵویستەیەکی کرد و ئاوڕی دایەوە سەیری یەکتریانکرد.

چاوی هەردووکیان گرێ دۆستایەتی بەست شوفۆرەکە دەستی تەوقەی هانی و بەگەرمیەوە دەستی یەکتریان گوشی.

- من ناوم ئیڤگینە

ماوەی چاوەڕوانیان تەوابوو سەرەی نووستیان هات.

دەستی لەژێر سەریدا دانابوو. بەپاڵکەوتنەوە دەیرِوانیە قەدی ڕووتی درختەکان هیواکانی بەسەر قەدی درەختەێکدا سەرخست لە لوتکەی چنارەکاندا هەموو هێواکانی کردە باوەشی هیلانەیەك بۆ خۆی و ئەننا.

خەوی لێکەوت لەخەویدا باوەشی کردبوو بە ئاسماندا وکۆمەڵە پەڵە هەورێکی ناخ تەڕی لەباوەشگرتبوو. ئەو دەویست تەڕای ناخی هەورەکان تەنیا بەسەر زەوی خۆشەویستی خۆی و ئەنذادا بباریێنی تا لەبەهاری خۆشەویستی وژیانی خێزانیدا پەڵەی هیوایان بدات و کۆرپەیەك ببێ بەسمبۆڵی خۆشەویستیەکی پاکی ڕەسەنی روسی.

دەنگی میخائیلی هاوڕێ بەئاگای هانیەوە . چاوە خەواڵۆکانی کردەوە.هەموویان لەدەوری ئاگرەکە گرتبوونەوە.

ئیڤگینی لەپێش ئەلکسەندەرەوە بەئاگابوو.دوای ناخواردن یەکی پێکی فۆدگایان کرد بەسەرخۆاردنەکەداو خۆیان پێچایەوە بۆ ڕویشتن.

تاریکی نێو دارستانەکە تاریکتربوو لەئاسایی .

سەیری مەکینەی لۆریکانیانکرد ومشەمای لورێکەیانیان قایمکرد.

بۆئەوەی کەمێك تاریکتربیت . لە نێوخۆیاندانە کەوتنە گفتوگۆ.

ترسی بێدەنگیان شکاندوو . ئەلکسەندەر لەسەر ڕەمتی گفتوگۆکانیان ڕوویکردە ئیڤگینی ووتی:

- ئیمشەو دەگەینە شوێنی مەبەست ؟

- گەر ڕێگە باش نەبێت ئەوە ڕوژێکی تریش لەدارستاندا دەژین.

میخائیل بەم پرسیارەی ئەلکسەندر بۆی دەرکەوت کەپەیوەندیەك لەنێوانیادا دروستبوە.پیباش بووئەویش لەتەك شوفیرەکی تەنیشتی گفتوگۆ دروستبکات.

مەکینەی لۆریەکانیان هاژدا.چاوی لایتی لۆریکان چەقی بەتاریکیە قەترانیەکەی ئامێزی دارستانەکەدا. پاش کەمێك گەیشتنە سەرجادەی قیر.

ئەلکسەندەر ڕویکردە ئیڤگین ووتی :

- باشە جگەرە ناکیشی .ئەمە شانسێکی باشە بۆ من .

- جگەرەم دەکێشا لێ کەعاشقی ژنەکەم بووم مەرجی پێکەوبوونمانی بەوازهێنان بوو لەجگەرە .

ئەلکسەندەر زەردەخنەیەك گرتی ووتی:

- دڵنیام لەوەی کارێکی باشت کردوە.نەم من نە ئەننا لەژیانماندا جگەرمان نەکێشاوە.

ئەلکسەندەر ترسیکی زۆر بیرکردنەوەی قۆرخکردبوو .ئیستراتجیتی گفتوگۆی بتەوکردنی ئاشنایەتی لەتەك ئیڤگینی تا نهێنی و جۆری کارەکەی پێبدرکینێ .

ئیڤگین گۆیدەگرت و هەردوو دەستی لەسوکانی ماشینەکە قایم گیرگرتبوو.تەنیا دەیرڕوانیە پێشخۆی و ئاوڕی بۆ لای ئەلکسەندەر نەدایەوە.ئەلکسەندەریش لەسەر قسەکردن و بەردەوام بوو .

ئیڤگین کەسێکی خاوەن ئەزموونی سەربازی و بارودۆخی شڵەقاوی روسیا بوو.دەیزانی ئەلکسەندەر وەك ملیونەها گەنجی رووس چاوەڕی کار و مسۆگەرکردنی ئایندەیە .

بەمەبستی گفتۆگۆ لەتەك ئیڤگین دا چەند جارێك ئەلکسەندەر فۆرمی دەبرڕینی ووشەوە رستەکانی گۆڕی. ئیڤگین هەر بێدنگ بوو.

- من بڕوام زۆر به چارەنووس هەیە .

لەترسی قورسی باری لۆریکەوتەڕی شەقامەئاوڕی لێنەدایەوە تەنیا سەری بۆ دەلەقاندوبە ئمێك قسەکەی ئەلکسەندەری پەسەندکرد.

- هەندی کەس بەڕیکەوت دێتە ژیانی مرۆڤەوە.ئەنجام دەبێتە هاوڕپەك لە برا باشتر دەبییت بۆ مرۆڤ .

ئیڤگین : سەریکی بۆ لەقاند

- هەرچەندە جیاوازی تەمەنی من وتۆ هەیە هیوادارم ئێمە ببین بەدوو هاورییەی باشتر لە دووبرا .

هەستیکرد ئەلکسەندەر تەمی ترسێکی زۆرچاوی هیواکانی تەڵخکردوە.

بۆ کۆمەکی رۆحی ئاوڕێکی خێرای لێدایەوە ووتی:

- هەروا دەبێت , بە هیوام .

پاش دووشەو ڕۆیشتن لەبەرە بەیانێکی زوودا . لایاندایە نێو دارستانێکی چڕ.

نێودارستانەکە چەشنی شارە میرووله دەوری نقولی تەڕ بدەن مرۆڤەکان دەوری سندوقە فیشەك وتەقەمەنەکانیان دابوو . شیرزە و ماندوو سنددووقەکانیان دەگویزایەوە نێو پیکاپی پچووکەوە.

کە لۆریەکان گەیشتن دووچەکداربەرەو ڕوویان هاتن وەك ناسیاودەستی سڵاویان بۆ ئیڤگینی بەرزکردەوە ئاماژەیان بۆشیونی وەستانی لوریەکان کرد.ك چەند کەسانێك رووبانکردە لۆریکان و بۆداگرتنی بارەکان.

***ئیڤگین و میخائیل و ئەلکسەندەر و شوفیرەکەی تر پێکەوە چوون بۆ خانوویەکی نۆی کەمیك دور لە دارستانەکە . خانویەك چەشنی خانووە نۆێکانی شار وباخچەدار .***

***ژورێکی ڕازاوە , پیاوێکی گەنجی هەڵەشە و دوو ئافرەتی شۆخی روسی لەئۆفیسیکدا بوون . پیاوەکە تەوقەی لە تەك ئیڤگین و شۆفیرەکەی ترکرد. میخائیل و ئەلکسەندەری پشتگۆی خست.***

***بە ئیڤگینی ووت***

- ***دوای پشودان دەبێت بگەڕیتەوە . لەم هەفتەیدا داواکاری زۆرمان لەسەرە بارەکانیشت ئامادەیە .***

***روویەکی بۆلای ئەلکسەندەر و میخائیل دا لارکردەوە ووتی :***

***- بە تەلەفوون پیووتم . دوو گەنجن وایە هیوادارم بتوانن کارەکانتان باش جێبەجی بکەن . یەکێ لە ئافرەتەکان .***

***بەچاوێکی پڕحەزەوە ڕوانیە جوانیەکەی میخائیل و نیگاکانی وەك هەردوو باڵە ناسکەکەی لە باڵای میخائیل ئالان .***

***میخائیل و ئەلکسەندەر کە بیستیان هاوڕێکانیان دەبێ بگەڕێنەوە تێگەیشتن کە بەتەنیاو لەناو جەنجاڵی ئەم دارستانە پڕچەك وتەقەمەنیەدا چ کاریکیان پێدەسپیرێ .***

***چوارچاوی ماندوو و ساکار و چاوەڕوان ئاراستەی چاوەکانی ئیڤگینی و شوفیرەکەی تر بوو .***

- ***ئیستا بچن پشویەك بدەن و دوای بگەڕینەوە بۆ لام بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەلکسەندەر و میخائیل کرد.***

هەرچواریان چوونەدەرەوە . بەدەم قسەکردنەوە لەسەر کۆمەڵی کەڵەکە بەرد دانیشتن .

ئیڤگین سەری داخستبوو وەك پیناخۆش بێت ئەم دوولاوە لەم دارستانە بڤە و کارە چارەنووسدارەدا بەجێبهیلێت .

دەنگی کز و ووشەکانی ماتەمینی بە ڕوویدا بڕابوون.

- خۆتان بیستان ئیتر ئێمە پێکەوە نابین و دەگەڕینەوە بە لورێك بارێکی تری لێبارکراوە . ئێوە لێرە دەمێنەوە چاوەڕی کاری نۆیتانن.

ئەلکسەندەر ترسێکی زۆری لێنیشتبوو دەیوسیت لەتەکیاندا بگەڕیتەوە ئەم دارستنە ترسناکە بەجێبهیلێ و هەوڵی کاریکی تر بدا.

وەك ڕەزامەندی میخائیل وەربگریت روویکردە میخائیل ووتی

- منیش دیمەوە لەگەڵتا نازانم کارم چیە لێرە کاربەمن ناکرێ . میخائیلش ووتی منیش هەروا

- ئێوە ناتوان بگەڕێنەوە . دەبێ بەو کارەش هەڵسن کە پێتان دەسپێرن. دەتوانن پارەیەکی باش پەیدابکەن و بەئاگاش بن . منیش ئەم کارەی ئێوەم کردوە لێ زۆر بڤە و ئاگای دەوی .

سەرێکی بەرزکردەوە روویکردە رۆژئاوای دارستانەکە.

- ئەو ڕێگە باریکەی دارستانەکە دەبینن ئەوە بەرە و سنوری ئەفغانستان دەچێ ماوەی کاتژمیری بەماشین دەچیتە خاکی ئەفغانستانەوە. کاری ئێوە گەیاندنی چەك وتەقەمەنیە لە رێگەی قاچاخچیەوە بەچەکدارەکانی ئەفغان.لەوەیشە بارتان بۆ ئامادەکراوە بۆ ئێرە . ئەوبارەی ئێمە دەیبەین باری ئەفغانیە . رەنگە هەفتەی

چەند جارێك بێ یان زیاتر.چونكە رێگاكان كۆیرە رێگان و لوری پێدا تێناپەڕی بارەكان پچوكدەكەنەوە بۆ پیكاپ وجێب .

- یانی ئێمە چەك دەبەین بۆ چەكدارانی ئەفغان ؟

- بەڵی

- سوپای روسیا لەتەكیاندا دەجەنگی و ئێمەی روسیش لەلایەكی ترەوە پڕچەكیان دەكەین؟

- ئەمە رەوشتی بازارە

- یان سیاسەتە

- كرۆكی هەموو جەنگێ سیاسەتەوە . كرۆكی هەموو سیاسەتێكیش پاراستنی بەرژەوەندەیە و بازرگانیە . لەیادت ماوە پێمووتی من ئەم كارەم پێ باش نیە . وەك بەنزینكردن بە ئاگردایە كەتێدا تەنیا منداڵ و ئافرەت داماوەكان قوربانین.

- ئەی لەوەیوە چێدەهێنن ؟

- حەشیشە و تلیاك

- ئێمە بەچەك وهێزی سوپا ئەفغانستانمان داگیركروە و ئەوان بە حەشیەشە و تلیاك.ئەمە بازاڕی ئەم سەردەمەیە ؟

ئەلكسەندەر و میخائیل لەپەشیمانی وترسا زەردبوون دەستیان دەلەرزی زمانیان بۆ ووشەیەك هەڵنەدەسوڕا .

ئیڤگین سەیركی میخائیلی كرد ووتی:

- میخائیل تۆ كوڕێكی قۆز و جوانی ئەو دوو ئافرەتەی لە ژوورەكەدا بینیتن ماشایان زۆر بە ئارەزووە سەیری تۆی دەكرد.

- ئاگابە بەزەردەخەنەکانی هەڵنەخەڵتی ئەو دوو ئافرەتە وەك کویلە وان کابرا بزانی پەیوندیتان هەیە کوشتنی تۆ و ماشا وەك نوشینی فۆدگا وایە بۆ ئەو.
- ئەو کەسێکە لەم ناوچەیە و ناو ئەفغانیستانیش نەك دەسەڵات رۆحی خوایەکی دڕندەی لە جەستەدایە.
- ئەوەی پیویست بوو پیمووتن . گەنجن و ئاگاتان لە خوتان بێت , دەتوانن ماوەیەك کاربکەن و دواجار بە بیانویەکی ژیرانە وازبینن , کارەکە زۆر ترسناکە بۆیە پارەکەی باشە.

هەستایە سەرپی و ئەوەی پیمووتن وەك ئەرکێکی مرۆی ئەوەی تریان دەکەویتە سەرشانی خۆتان.

من و هاوریکەم دەچین سەرخەوێك دەشکێنین . ئێوە چاوەڕی بن هاکا ناردی بەشوینتانا .

وەك دوو جەستەی مردوو کە هەناسە بدەن . وەك دوو پەیکەر کە خوێن ترازابیتە چاویان میخائیل وئەلکسەرندەر لەدووریانێکی ترسدا بیرکردنەوەیان بزبووبوو.

شەو درنگە و دارستان خامۆش . سندووقە چەکەکان لەبەرسنگی ئاسمانێکی تەڵخدا بۆنی مەرگی هەزارەها منداڵی بێتاوانی ئەفغانی لێهەدەسا.

هەر فیشەکێك چاوەڕی برینی جەستەی مرۆیەکی بێتاوانی دەکرد.

ئەلکسەندەر و میخائیل لەژوورێکی قورینی کۆن لەسەر دووکورسی دانیشتبوون . ژوورەکە بە دووکەڵی جگەرو بۆنی خواردنەوە

غاڵبەغەبی کریکارە سەرخۆشەکان قاندرابوو . لەچاوەڕوانی بانگکردن بوون.دەستێك راچڵەکاندو پیاوێك بە ئاماژە دوای خۆی خستن. بردنی بۆ ژوورێکی تر کە ئۆفیسی خاوەن کارەکەبوو. ئۆفیسیکی ڕازاوە ژورێکی پڕفەرش و تاقمی قەنەفەی گران بەها مێزێکی شووشە بەویسکی و ڤۆدگا و ماسی و زەڵاتە ڕازابووە هەردوو خانمەکان بە شێوەیەکی زۆر سیکسی خۆیان گۆڕیبوو لەتەنیشت خاوەنکارەکەوە لاقەکانیان خستبوە سەریەك شلکەی رانی ناسکیان نیشانی چاوی ئۆڤیسەکەدەدا.

میخائیل لەترسی نیگای چاوی ماشا سەری داخستبوو , نەیدەوێرا سەر هەڵبڕێ . ئەلکسەندەر چاوەڕێ ئەرکێ بوو

خاوەنکارەکە مژێکی قوڵی لەچروکەکەدا و قۆمی ویسکی نوشی و دەستی بۆ کەسیك ڕاکیشا پیاوکی چاو و مورەش

- ئەمە هاوکارمانە و ئەفغانیە و زمانە رووسیەکەی لە هی من باشترە . ئیمشەو ئەرکتان پێدەسپیری و رێگەتان پینیشان دەدا. ئیترخۆتان کارەکانتان دەکەن. برونەوە بۆ شوینی خۆتان چاوەڕیی بن.

وەك لە دادگا بووبێتن وسزای هەڵواسینیان پێدرابێ ئاوە گەڕانەوە بۆ شوینی خۆایان.

شەودرەنگی کرد هیچ هەواڵێك نەبوو.

سەرخۆشەکان هەندیکیان لەسەرمێزەکان پرخەیان دەهات.

میخائیل بەئەسپای ترسەوە بە ئەلکسەندەری ووتی:

- ئەلکسەندەر ئەم کارە کاری ئێمە نیە دەڵێ چی بە بیانووی سەرئاوەوە هەڵبین . هەرئەوەندە بگەینە نێو دارستانەکە ئیترکەس نامان دۆزیتەوە.

- بیرێکی زۆرچاکە . بەڵام من ترسێك هەموو جەستەمی ئیفلیج کردوە . مێشکم توانای بیرکردنەوەی نەماوە , چ هەڵەیەکی گەورەمان کرد. ماڵی بێکاری کاولبێ مێشکی مرۆڤ ئیفلیج دەکات.

- دەترسم هەڵبێن ودەستگیرمان بکەن . ئەی گوێت لێنەبوو ئیڤگینی ووتی کوشتنی مرۆڤ بۆئەو پیاوە وەك خواردنەوەی فودگاوایە ؟

- ئیستا کەس بە ئاگانیە بڕواش ناکەم ئیمشەو هیچ کاریکمان پێبسپیرێ .

- ئەی تۆ لەو باوەڕەدای ئەم هەموو چەك و تەقەمەنیە پاسەوانی نەبێت ؟

- بۆ نا ئێمە بە شێوەیەك دەڕوین نەمان بینین , تاریکای شەوە دەڵێ سەرپۆشی ڕەشە و ڕووی دارستانەکەی داپۆشیوە .

لەم تەگبیرەدابوون ئەفغانیەکە هاتە ژووری. خۆی باش پێچابووە بە پەنجە ئاماژەی بۆ کردن . بۆ ڕویشتن ڕووی پرسیارەکانیانی کاڵکردەوە ئەلکسەندەر ماشینەکەی لێدەخوری ومیخائیل لەتەنیشتیەوە ئەفغانیکەش بەکلاشینکۆفەوە لەپشتەوە ڕێگەی نیشان دەدان.

بەیانی زووگەیشتنە کەلاوەی دێیەکی سوتاو.

بۆنی تۆپینی سەگ و ئەسپ مەروماڵات ناوچەکەی هەراسان کردبوو.

بارەکانیان داگرت . لە کەلاوەی خانویەکدا شاردیانەوە

لەبەرچاى خۆاردنداببوون دەنگى پەيدابوونى ووڵاخ دەهات بۆ ئەفغانيەكە ترسيك نەبوو ئەلكسەندەر وميخائيل لەترساندادەميان لە جودانى خۆاردنەكەى وەستا.

ئەفغانيەكە زۆربەساردیەوە ووتى:

- مەترسن هاوڕيى خۆمانن وباريان بۆ ئێمە هانيوە .

پارەكانيان گۆڕيەوە .

گەڕان لە دوو ئايندەيەكى ئاسودە و بەختيار بۆ دووگەنجى سەرتا تەمن ودڵ پڕ لە خۆشەويستى ژيان . ترسيانى كاڵكردەوە ترسى سەرەتاى لەدڵدياندا نەما . هەموو كۆتاى مانگى كە 1000 دۆلارەكەيان وەردەگرت بەدەستيان بوايە پاڵيان بە رۆژەوە بنايە بۆ سەرى مانگێكى ترى .

بڕياريانداببوو تا پارەكەيان زۆر نەبێ واز لەم كار نەهێنن.

ترسى گەورەيان شاردنەوە وهەڵگرتنى پارەكانيان بوو لەژير بەرگەكانيانەوە تووند بە رانيانەوە بەستبوو.

ماشا لەنيگاى سەرەتاييەوە شەيداى ميخائيل ببوو . دەيزانى ئايندەيەكى دڵتەزين چاوەڕى ئەو دووگەنجەدەكات.

لەدڵەوە ميخائيلى خۆشدەويست . چەند جارێ بيركردەوە لەتەكيدا بدوێ . ريكەوت نەبوو

ڕۆژێك بەرەو رووى يەك بوونەوە . ميخائيل ترساو . ماشا قوڵى گرت ڕايجڵەكان .

- واز لەم کار بهێنن.ئەم ناوە بەجێبهێڵن . ژیانتان لەمەترسیدایە ڕۆیشت

دەستێکی بۆ ڕانی بردوو ژمارەی دۆلارە پێچراوەکانی ڕانی پەشیمانی کردوە هیچی بەئەلکسەندەر نەوت .

هێندە بەو ڕێگەیدا ڕۆیشتبوون . ناو و چیرۆکی گشت دیهاتە سوتاوەکانی نێوان سنوری ئەفغانستان وروسیان دەزانی .

ئێوارەیەکی سارد هەورەکان وەك لەزەوی پرتاوانی مرۆڤ کوشتن تورەبووبێت ئاسمانی ناوچەکەیان تەلخکردبوو. ئاسمان تروسکای ڕووناکیەکی بەزەوی نەدەبەخشی . کاتیش زووبوو بۆڕێگە بینین لایتی ئۆتۆمۆبیبەکەیان داگیرساندبوو.

کەمێکیان مابوو بگەنە شوینی دیاریکراوی خۆیان بۆ داگرتنی بارەکان.

ئەلکسەندەر بەدەم ووردە گۆرانیەوە ماشینەکەی هاژدەدا .

میخائیل لەدڵەخورپەیەکی نادیاردا ڕووی گرژببوو.

لەووردکردنەوەی قسەکەی ماشادابوو. مات وبێدەنگ چاوی بڕیبووە رێگاکە . ترس هەرچواردەوری لێکردبوو بەچرنۆکی درندەیەکی ترسناك.

بە ئەلکسەندەری ووت :

- کەی واز لەم کار بهێنین ؟

ئەلکسەندەر چونکە ئاگای لەخورپەو ترسی دەروونی میخائیل نەبوو .

بە پێکەنینەوە دەستیکی دابە شوێنی شاردنەوەی دۆلارەکانی ڕانیان ووتی :

- با کەمێکی تر ڕانمان ئەستورتربێت واز دەهێنن .

- من زۆر ترسم هەیە

- لە چی؟

- چەندمانگە ئەم کارەدەکەین گرفتیکمان نەبوو ؟ ئەم سنورە کاولکراوەش نەك مرۆڤ باڵندە کێویەکانیش لەترسی جەنگ کوچیانکردوە. باپارەکەمان بگاتە ئاستیکی باش.وازدەهێنین

- چۆن شەو بۆ دز خێوەتێکی تاریکە . چۆڵەوانیش بۆ تاوان گۆڕەپانێکی بێ ترسە.

- بەرێکەوت ماشام بینی بە تورەی و ترسەوە ووتی :

ئەلکسەندەر چاوەکانی زەقکردەو ووتی:

- چۆن زاتت کرد بیبینی ؟ ئەی ئامۆژگارێکەی ئیڤگینت لەبیر ماوە ؟ ناتاش چی ووتی ؟

- ووتی واز لەم کارەبهێنن ئەم ناوچەیە بەجیبهێڵن .

هەردووکێیان بێدەنگ بوون ئەلکسەندەر ترس روحی گوشی

- تۆبڵی مەبەستی چی بوبیت؟

- نازانم من زۆرترسم هەیە . ببورە زوو ئاگادرم نەکردیتەوە.

ماشا کۆیلەی خاوەنکارەکەیە و لێی نیزیکەو ئاگای لەزۆر نهێنیە.

دەنگی گۆرانیەکەی کزکرد.

لێخوڕینی ماشینەکەی هیواشکردەوە .

ئەو قسەیەی ماشا و ئامۆژگاریکەی ئیڤگین یەك سەرچاوەی ترسیان هەیە . ڕەنگە ئیستا ئیڤگین وازی هانیبی ماوەیەکی زۆرە بوونی

نیە.ووتەکانی ئیڤگین هەم ئاموژگاری بوو هەم ووریاکردنەوە و دڵسۆزی ئەو عاشقی خێزانەکەی وکۆیلەی دڵسۆزی دوو کۆرپەکەییتی.

- دڵنیام ئەو راستیانەی بۆ باسکردم ئاگادارکردنەوەی من بوو ئەو لە ئێمە بە تەمنترو خاوەنی ئەزمونێکی زۆرە.

- پێش ئەمکارە نامەیەکم بۆ ئەنا نووسی و 200 دولارم بۆ نارد ئیستا چاوەرێمە.هەموو ژیانم لەبەر تیغی غەدری ئەم کارەدا تەنیا لە پێناوی ژیانی ئاسودەی ئەودا داناوە.ژیانم ئەوساتە خۆشدەویت کە ئەو تێدا بوونی هەبێ . سروشتی مرۆڤ وایە تا مەودای رۆحەکان دوربێت خۆشەویستیەکان بێ ئۆقرە دەبن . ئەوساتەشی دوو روحی دووجەستە یەکتری لەئامێزدەگرن رۆحەکان ئۆقرە دەیلاوینێتەوە.

- بۆ زوو قسەت نەکرد ؟ دەزانی ماشا لەتەك ئەو پیاوەدا دەژی ڕەنگە زۆر نهینی بزانی نەویری راستەوخۆ پێمان بڵی .

- هەڵە بووم هیوادارم هەڵەکەمان گەورەتر نەبیت .

پیچپی نێو شاخەکان لە پێدەشتەکان تاریکتربوون.

لەپێچپێکی تەسکدا لەدوورەوە تیشکی چەند لایەتێك وەك سوژنی سورەوکراوە چزا بە چاوی هەردووکیاندا . بەرەو ڕووناکی گڵۆپی ئۆتۆمبیلەکە نزیك و نزیکتربوونەوە چەکەکانی دەستیان ئاشکرابوو زانیان بۆسەیە و بۆیان دانیشتون و بەپەلە دابەزین هەڵهاتن.

ئەلکسەندەر بەلای راست ومیخائیل بەلای چەپدا کۆمەڵە دەست رێژێکیان لێکرا . دەفەی پشتی ئەلکسەندەر هێند فیشەك برِی مۆڵەتی تەنیا هەناسەی ئۆفێکی بۆ ئەننا نەدا.

***فیشەكێك شلكەی ڕانێكی میخائیل زامداركرد و دوا بینینی ئەلكسەندەری هاوڕێ لەسنوری نیگایەكی پڕترسدا لاشەیەكی بێ هەناسەی بینی . لەنێو تاریكایی پێچی شاخ وبەرداشەكان خۆی شاردەوە و لەسنوری چەكدارەكان دووركەوتەوە ئەوانیش چەند دەسترێژێكیان بەنێو تاریكای شەوەكەداكرد.***

***لەحەشارگەكەیەوە دەیرڕوانیە ئۆتۆمبیلە چۆن چەكدارەكان لاشەكەی ئەلكسەندەریان ڕاكیشایە بەر ڕووناكیكەو وەك شارەزابن بەشوینی شاردنەوەی دۆلارەكان بە چەقۆیەك پانتۆڵەكەیان هەڵدری دۆلارەكانیان لەڕانی كردەوە.لاشەكەیان فرێدایە دۆڵێكەوە.***

***بەبینینی ئەو دیمەن وچارەنووسی هاوڕێكەی ئازاری زام ورۆح ترس وهیوا . كردی بەپەپۆلەیەكی باڵشكاوی ژێر كەڵبەی تیژی چەند میرۆلەیەكی برسی .***

***میخائیل قسەكەی ماشای هاتەوە یاد زانی پێشكات خاوەنكارەكە نەخشەی كوشتنیانی كێشاوە***

***بەلاقێكی زامدارەوە بە جەستەیەكی ماندوو ترساوەوە .***

***بەدرێژای شەوەكە بێ ئەوەی بزانی بۆ كوێ دەچێت دارستان وكێو شاخ و چۆڵەوانی بڕی .***

***دوای دوركەوتنەوە لەشوێنی ڕووداوەكە.بۆحەوانەخۆیخزانە نێوان دوو تاشەربەرد و لەسەر گیاشیاویەكانی نێوتاشە بەردەكان خەوێكی پچڕپچڕ بزركاو ئامێز ترساوی لێكەوت . خوێنی دەمی برینی گولەكە تۆپەڵ تۆپەڵ بەسەرمای شەوەكە بەدەوری برینكەدا مەیی.***

بەیانی کە زەردە رووی گەشی خۆی نیشانی ڕوومەتی زەویدا ڕووناکی هەتاوێکی کەمتین پیستی پێلوەکانی میخائیلی برِی و ڕووناکی روژی پینیشاندا.بەئاگا هاتەوە . بەئاستەم لە ئامێزی تاشەبەردەکە هاتەدەری سەیرێکی سنوری بینینی خۆی کرد هیچ ئاوەدانیەکی نەبینی .

قەمسەڵەکەی داکەن وبەتیغەبەردێك بەرگەکەی برِی ودۆلارەکانی لەڕانی کردەوە ختیە قەمسەلەکەیەوە.بەپەڕوی بەستنی دۆلارەکان دەمی برینی فیشەکەکەی بەست.

لقەدارێکی ووشکی هەڵوەری درەختەکانی کرد بە گوجان ویارمەتیدەری لاقە زامدارەکەی . ڕویشت و نەیدەزانی بەروکوام لابرِوات . برسی بوو هاواری گەدەی لەترساندا نەدەبیست . دەترسا وبەدەم شەللە هەنگاوەوە دەگریا . تەنیا خۆی دەنگی گریانەکەی دەبیست. چۆڵەوانی چۆارچاوی لەرۆحیا دروستکربوو. دەنگی خپەی مارێ . فرِینی باڵندەیەك قیژەی قاقوژەیك ترسی گوللەکانی دەهانیەوە یاد.

ماوەیەك ڕۆیشت لەرِەوتی ڕۆیشتنکەی پەشیمان دەبووە دەترسا بەهەڵە بچیتەوە سەرهەمان ڕێگەی لاگەری قاچاخییەکان.

ترسا بچیتەوە ئەورێگەی ئەلکسەندەریان تێاکوشت.

لەبێ دەسەڵاتیدا پاڵیدا بەگابەردێکەوە لاقە برینداەکەی ڕاکیشا وبەئاستەم وترسەوە پەرۆی برینەکەی کەمێك بەرزکردەوە . قەدماغەی برینەکە دڵخۆشیکرد.خۆینی لێنەئەچۆرِا.

وەك خوا بەهانیای ترسەکەیەوە هاتبێ بۆنی سوتانی ووشکەدار هەڵویستەیەکی پێکرد.

- بوونی ئاگرێك لەم نزیکانە هەیە .

- یان ئاواوەدانیەکە؟

- شوانێك ؟ جوتیارێك؟ بۆنی سوتاندنی دیهاتێکی تری ئەفغانیە؟ ئێرە کۆ بێ؟

- خاکی ئەفغانەستانە یان روسیا؟.

لەناوچڕەیەکی کورتە باڵادا.چەند باریکە دووکەڵێك بەرەوئاسمان دەکشان و لە قوڵایدا باوەشیان بەیکدادەکردوبۆنیان بەسەر ناوچەکەدا بەخشدەکرد.

بەشەلەشەل لەچڕەکە نزیك کەوتەوە بەئەسپایی وترسەوە لقی درختەکانی وڵاکرد بینی .

لەنێوەڕاستی چڕکەدا زێیەکی گەور.دووماسیگرلەبەرگێکی ئەستوورخۆیان پێچابووە بەدیار قولابەکانیانەوە دانیشتبوون چەند ماسییەکیان لەسەرئاگرە دەبرژاندن .

لەسەر ڕاخەرێك بتلی ڤۆدگاو چەند خەیار وتەماتەونان وپەنیریان پەرشکردبوو قۆری چایەکیش لەقەراغ ئاگرەکەبوو قوڵپیدەدا بۆنی برژاندنی ماسەیەکان وبۆنی چاکە تێکەڵاویەکی پرتامیان بەگەدەی برسیی میخائیل نۆشی..

ماسیگرەکان بەدەم ووردە قسەوە لەچاوەڕوانی برژاندی ماسیەکانی سەر ئاگرەکەو نیچرەماسی تربوون.

تێگەیشت ئەو دووپیاوە روسن ماسیگرن کەسانی بڤەنین خەڵکی دیهاتی ناوچکەن.بەشەلەشەل وبەخشەی خشاندنی قاچە زامدارەکەی بەزویدا رووی هەردووماسیگرەکەی بەلای خویدا وەرچەرخان.
ماسیگرەکان دەستیان لەقولەپەکان بەرداو بەرەو ڕووی ڕۆیشتن.
وەك پەنیایەك دەستێکی بۆدریژکردن داوای کۆمەکی کرد.
باوەشیان پێداکرد و لەنزیك ئاگرەکە راخەرێکێان بۆ یەکالاکردەوە.
چایەکیان بۆ تێکرد.لەتاو ترس ومانوبوونی نەیتوانی هیچ ووشەیەك بڵی ماسیەکان برژان. ماسیگرێکیان زورترین بەشی ماسی خستە بەردەمی.بەسوزەوە فەرموویان لێکردوو زانیان ترس وبرسیتی توانای قسەکردنی لێبریوە.
( ئەم گەنجە زامدارە یان سەربازی هەڵهاتووە یان قوربانیەکی بازاری قاچاخچیتی سەر سنورە).
( هەرچیەك بیت مرۆڤێکەو پیویستی بە کۆمەك هەیە )
ئەمەپرسیاری چاوی ماسیگرەکان بوو.

**ناتاشا جڵەوی فرمیسکەکانی بۆ نەدەگیرا**

**لەتەك هەر رستەیەكدا گەروی بۆ دەبڕینی رووداوەکە تەسكتر دەبووە .**

**پەیکەرێك لە فرمێسك**

**جەستەیەك لەخۆشەویستی.**

**مرۆڤێك لەئازار.**

**پاڵەوانێکی بێناونیشان.**

**مرۆڤێکی بێپشتیوان.**

**خانمێکی سکپڕی بێ ناز**

**ئەننا سەری شۆڕکردبوو بە سەر کۆشیدا مووەکانی قژە خورماییەکەی سێبەرێکی ماتەمینیان لەسەر ڕووی نەخشاندبوو.**

**هێندە فرمیسکەکانی بەخوڕبوون وەك ئەوەی گشت خوێنی ببوبێتە ئاو و لەبۆشای چاوەکەنیەوە بڕژێنە رۆحی تراجیدیا چیرۆکی کوشتنی ئەلکسەندەرەوە.**

**بەبێدەنگی قوڵپی ناخێکی گەرم زمانی لەهاوار و قیژە بڕیبوو ناتاشا .**

**هەنسکەکانی دەبوون بەچەپکە شیوەنێکی دڵسۆزی بۆ چارەنووسی خۆشەویسترین هاوڕێ.**

ترسا ئەننا دڵی وەستابێت نە جوڵەیەك نەورتەیەك تەنیا فرمیسکەکانی چاوی بەڵگەی زیندووبوونی بوون.

لێ نزیکبووە وەك کۆترێکی سڕی نێو کرێوەی بەفر لەباوەشی گرت و سەری لەسەر نەرمۆڵەکانی دانا.

به سووکی ولەژێر باڵە پڕسۆزییەکانی ناتاشادا . ووتی :

- ئەی میخائیل چی بەسەرهات

لەدوا سەردانەدا ووتی من ئەم شارە جێدەهێڵم.دەچم بۆ لای نەنکم له دێیەکی دوور له ئۆکرانیا دەژی . هەوڵدەدم ژیانێکی سادە پێکبهینم کەس نەمناسی چونکە ئەو پیسانە بەدوامدا دەگەڕین تەنیا من شوینی قاچاخچیەکان و کوژەری ئەلکسەندەر دەزانم .

دەترسم منیش بکوژن

تەنیا ڕاسپاردەم تکایە بەئەننا بڵی ئەلکسەندەر دوا هەناسەی بەخۆشەویستی ئەنناوە دا .

- یانی ئەو کەسەی کاری بە ئەلکسەندەر کردوە کوشتویتی؟
- ئا خاوەنکارەکە بۆ ئەو پارەی پێداون.

هەناسەیەکی هەڵکێشاوچووە بەرتاریکای پەنجەرەکەوە ڕوانیە شەوەکە ووتی:

- تەنیا دایکم دەزانی سبەینێ چی ڕوودەدا.

- ئەوانەی ئیستا ڕوودەدەن دایکم بەزرنگی خۆی پیشبینی کرد. هەرچیەکی ووت وەك خۆی هاتەدی.من بووم بەو ماسیە گۆشت

شیرینەی دەستی نەهەنگەکانی شار ئەتکیان کردم و ئەلکسەندەر ئەو گەنجە بێکارەی . کار سەری خۆارد.

ئەوەی ماوە دەبێ من بزانم لەسبەینیەوە چیدەکەم ؟

ناتاشا لەپشت ئاننەوە وەستابوو دەترسا ولەزۆرانی دەرونیدا بشکێ و لەپەنجەرەکەوە خۆی فرێبداتە خوارێ.

کەگۆی لەدوارستەی بوو

(ئەوەی مابێ دەبێ بزانم لەسبەینیەوە چیدەکەم)

لەخۆشی ئەو هێز و باوەڕ بەخۆبوونەی ئەننا باوەشی پێداکرد.

جارێکی ترخۆشەویستی هەردووکیانی کرد بە پاڵەوانی چیرۆکەکانی داهاتوویان .

کات تێپەری وبوون بەدووکاردار لەچێشتخانەیەکدا.

ئەننا هوشیاربوو لەبەرجوانێکەی نەیدەویست لەهۆڵی نان خواردن وچاوی مێوانەکاندا کاربکات.

لەچێشتخانەکەدا کاری دەکرد خاوەنکارەکە پیاوێکی بەتەمەن ودڵسۆز وەکی کچی خۆی تێدەڕوانی بەتایبەتی کە ڕۆژ بە ڕۆژ کۆرپەکەی گەورەتر وگەورەتردەبوو.

رۆحی ناتاشا پیاوێکی ڕاوکرد و لەماوەیەکی کەمدا پەیوەندیان هێندە جوانبوو هەردووکیان ئۆقرییان بۆ یەکتری نەما بۆیە بڕیاندا پێکەوەبژین .

ئەننای سکپڕ و رۆح سوتاو بە تەنیا کەوت .

لەماڵی دایە پیرەیەکی هەژار ژوورێکی بەکرێگرت.

شۆینـژێنکی کۆن لەقاتی پێنجەمی خانویەکی داتەپیوو.
شۆخێکی سکپری بێکەس . دایە پیرەیەکی خاوەن میژوویەکی پیر دەروونەکان چونکە پاك ومرۆڤەکان ئارام وهەژار. ماوەیەکی زۆری نەویست پەیوەندیەکەیان بووبە پەیوەندنی دایك وکچ.
ئەننا فریشتەیەکی خودای بوو نەك بەدووباڵی سپیەوە بەسکێکی بەرز وجەستەیەکی ماندوو ڕۆحێکی سوتاووە .
لەجەنگی گرفتەکانی ژیاندابوو.
ئەوهەموو پاشماوە خواردنەی لەمیوانەکان دەمایەوە و فڕێ دەدرایە نێو تەنەکەی زبڵەوە. گەربدرێ بە برسی و بێلانەکانی سەرشەقامەکان چاکتر نیە؟ ئەمە پرسیاری هەستی ئەننا بوو بۆ مرۆڤە داماوەکانی دەرەوە سنوری خۆی .
ڕۆژانە گەر تەنەکە زبڵەکانی چیشتخانکانی شار بەسەر هەژارانی شاردا دابەشبکرێت چەن مرۆڤی برسی برسیتی دەشکێ ؟
بەدەم کارەوە ولەتەك خۆیدا دەدوا.ووریای و خۆشەویستی وکارجوانی نەك خاوەنکارەکە وەك کچی خۆی تێدەڕوانی گشت هاوکارەکانی بەرێزەو سەیریان دەکرد.
رۆژیك بەشەرمەوە لەتەك خاوەنکارەکەدا دووا.
داوای لێکردگەر بۆرار هەبێ ڕێگەی بدا لە خواردنە پاشماوەکان هەندی خواردن بەرێتەوە بۆ ئەودایە پیرەی لەتەکیدا دەژی.
چاوی خاوەنکارەکە پڕبوو لەئاو لەسەرکورسێکەی هەستایە سەر پێ وەك کچی خۆی دەستی بەسەریدا هانی مۆڵەتی ئەوەیدا نەك پاشماوەی

خواردن دەتوانی گۆشت , مریشك , میوەی بەکارنەهاتووش بەریت.ئەننا پەسندی نەکرد.تەنیا ئەوخواردنانەی دەبردەوە کە دەمایەوە.

شەوێکی ساردی زستان بوو لەبەر ئەوەی کۆرپەکەی سکی سەرمای نەبێ زۆر ئەستور خۆی پیچابووە قورسایی سکەکەی هەنگاوەکانی کورتکربووە چانتاکەی وکیسەیەك خواردنی پاشماوەی بەدەستەوەبوو.

لە ترسی خزاندنی زەویە لووسە سەهۆڵاوێکەش هەنگاوەکانی بەئاستەم وبە ئاگایەوە دەنا.

لەدوورەوە تۆپەڵە تارمایەك لەژێرچەتری باڵکۆنی ساختومانێکدا سەرنجی ڕاکێشا. لێان نزیك بووە دوو مرۆڤی بێلانەی بینی لەترسی سەرما وا باوەشیان بەیکداکردبوو لە تۆپەڵی پاتاڵی تێکەڵاودەچوون.

لەبەردەمیاندا وەستا تەنیا بەهەناسەداندا زانی زیندوون.

بانگیکردن . ئەوانیش سەریان لەژێر سیپاڵە تۆخەکە دەرهانی.

چ کارەساتێك رۆحی ئەننای لەرزان دوو گەنجی ناوەراست تەمن.گەنجێکی ڕیشهاتوو کێژیکی شۆخی دەموچاو چلکن وماندوو.

- برسیتان نیە ؟

هەردووکیان وەك فریشتەیەك پرسیاریان لێبکات زیتبوونەوە.

بەدەنگێکی پڕ تکاوە ووتیان

- ئا برسیمانە دوو ڕۆژە نانمان نەخواردوە.

کیسە خۆاردنەکەی دانا ورۆیشت لەسوجی ساختومانەکەدا هەڵوێستەیەکی کرد و ئاوڕی لێدانەوە.بینی چۆن بەهەردوو دەستیان خۆاردن دەخزینە دەمی برسیانەوە.

گەڕایە ماڵەوە پێنج قات قادرمە بەسکێکی قورسەوە تادەگەیشتە شوێنژینەکەی جەستەی دەکەوتەسەرئاو.

دڵخۆشی خۆی بەوەدەدایەوە پزیشك پێوتبوو وەرزشی تایبەتی خانمانی سکپڕ تەندروستی بەکۆرپەکە دەگەینێ.

دایە پیرە وەك چاوەڕی کچی خۆی بکات لەسەر چرپاکە ملی نابوو بەلارەوە تەلەفزوینەکە بەدەنگێکی کزدەدوا.

بەدەنگی بادانی کلیلی دەرگاکە دایەپیرە زیتبووە . بەبوونی ئەننا دڵخۆش بوو.دوای خۆشتن چیرۆکی برسی بوونی ئەو دووگەنجەی گێراپەوە.

دایە پیرە ووتی

- کچم تەمەنی گەنجیتی من گشتی برسیتی بوو.ئافەریم بۆ رۆحی پاکت.من لەئازاری برسیتی دەگەم. ئێمە بەشی خۆمان هەیە. خوا گەورەیە بۆ سبەینێ.

ژیانێکی نایەکسانی کۆمەڵگای تەتەڵەکرد بیردۆزە ئابوریەکانی دایکی هاتەوە یاد.

مارکسیەتیش نەیتوانیوە گرفتی برسیەکان چارەسەربکات.

لەتەك دایە پیرەدا بەدەم خۆاردنی شۆرباوە قسەیان دەکرد

- کچم سکەکەت چەند مانگانە ؟

- هەشتم تەواوکردو لەسەرتای مانگی نۆدام

- دەزانی ئیستا کاتی پشودانتە . پیویست ناکات کاربکەیت

- دایە لەم شارەدا بێ کار ژیان بوونی نیە

- ڕاستە تۆ لەخۆینی من نیت لێ ڕۆژگار تۆی کرد بەکچم . تاقە کوڕێکم هەبوو(ئاوڕی بەلای وێنەی کوڕە سەربازەکەیدادایەوە)ئەویش بوو بەقوربانی ئەفغانستان.

چاوەکانی قەتیس بوو، ووتی

- تۆ بووی بەکچی من. بۆنی ئەو جوانەمەرگە لەتۆ دەکەم . خەمی کرێ خانووت نەبێ هەروەکو هەمیشە پێکەوە دەژین . خوا گەورەیە.

سەردانی پزیشك دەکەیت؟

چاوەکانی بەرگیی تەنکی تەڕیان بەست . دەستە چرچەکانی دایە پیرەی گوشی. زۆرم پێخۆشە کەدەڵێت خوا گەورەیە .

- کچم تۆ کەس و کارت لە کۆین ؟خوشك وبرا دایك وباوك ؟

هەناسەیەکی هەڵکیشاو خۆشەویستی و هوشیاری دایکی و دڵسۆزی باوکی هاتەوە یاد

- خۆشك وبرام نیە من تاقانەی دوو مرۆڤی بەرێزم دایك وباوکم .

- خانەنشین و بە کولەمەرگی لە دێیەکی دوور لەم شارە دەژین

- پەیوەندیتان چۆنە ؟ دەزانن سکت پڕە .

- نە

- بۆ کچم ؟

- دایە پیرە چیرۆکی من پابەندە بە زامی دوو دایك و دوو باوکەوە .

- دایك وباوكی من و دایك و بابی ئەلكسەندەری خۆشەویستم

- یانی باوكی كۆرپەكەت ؟

- باوكی كۆرپەكەم ئەلكسەندەر نیە؟ ئەلكسەندەر كوژرا .

سەرمێزەكەی جێهیشت ودایەپیرە تێگەیشت گێڕانەوەی چیرۆكەكە ئازار بە خۆی و كورپەكەی دەگەینێ .

لەپشتەوە لەباوەشی گرت وسەری ماچكردو بەئەسپای ومیهرەبانیەوە دەستی بە سكیدا هانی و ووتی:

- كچم كۆرپەكەت كورە یان كچ ؟

- پزیشك ووتی كچە .

- بە دڵنیایەوە وەكی خۆت جوان دەبێت .

- خوا گەورەیە دایە .

## قاوشی نەخۆشخانەکە

لەخانمانی سك پڕجمەی دەهات.

هەندێکیان بەسکی پڕەوە لەنێو قاوشەکەدا پیاسەیان دەکرد وچاوەڕی تێپەڕبوونی کاتبوون . لەژێر چاودێری پزیشکدا بوون.

لەسوچیکیدا خانمێکی سکپڕ سەرینابووبەسنگی هاوسەرەکەیەوە هیواکانیان پێکەوو گرتبووە باوەش .

چاوەڕی کۆرپەیەکی هیوایان بوون .

لەسەر تەختێك ئەننا پاڵکەوتبوو . ناتاشا و دایە پیرە لە دوولاوە هەردوو دەستیان گرتبوو.بەتەوژمی خوێنی گەرمی دەستیان رۆحی تەنیای ئەننایان ئارم دەکرد .

سستەریك هات و پاڵی بەگالیسکەکەی ئەنناوە بۆ ژوری منداڵبوون نا.

ناتاشا لە تەکیدا چووە ژوورەوە.

پێش ئەوەی پزیشك بێت .

ئەننا دەستی ناتاشای توونـد گوشی قورگی قوڵپەی گریانێ تێدا عاسی بوو بەدەم گریانەوە ووتی :

- ناتاشا تکایە ئەگەر من بەسەر منداڵەکەوە مردم .

ناوی بنێین(ئەلکسەندەرا)بالەنێوان دایك من و دایکی ئەلکسەندەردا گەورە ببێ. ببێ بەیادگاری من وئەسکەندەربۆ دوو دایکی پیری چاوەڕوان و دێیەکی داماو.

ناتاشا چەمایەوە ئەنناى ماچکرد.

- تۆکەسێکی زۆر بەهێز و بەتوانایت.من ئێرەیەکی جوانم بەرامبەرت هەیە.پزیشکەکانیشمان زۆر لێهاتوون.ترست نەبێ پاشماوەیەکی کەم تۆدەبیتە دایکی کێژێکی جوان ومنیش پوور.

بەدەم زەردەخەنەوە

= دایە پیرەش دەبێتە (بابوشکا) .

چونکە هەموو هیوای بەکورپەکەی سپاردبوو.دەیزانی مرۆڤەکان کە لەدایك دەبن پاکن وسروشتی کۆمەڵایەتی پیسیان دەکات.

دایك رۆڵی مەزنی هەیەدەیویست بە ئاسای وسروشتی کورپەکەی ببێ.هەمووژانەکانی منداڵبوونی لێبوو بەهیوا .

هیوا بوو بەهێز. هەموو هێزی دەدایە ماسولکەکانی ناوگەڵی تا بە سروشتی کورپەکەی ببێ.

لەچۆڕاوگەی چاوەکانیەوە فرمێسکی سۆزی دایکایەتی دەتکا.لەگووشینی پەنجەکانی دەستی ناتاشا هێزی بەرنگاربوونەوەی ئازارەکان باڵادەبوون.

تەکانەکان بێ هاواربوون . فرمێسکەکان بۆنی عەتری بەهشتی دەروونی پاکی دایکایەتی لێدەهات.

ئازارەکان بێ خۆڕاپسکین وپەلهاویشتن بوون.

***نۆتەی چەپکە قوروسکەی کۆرپەکەی ئاوازیك بوون رۆحی پڕئازاری ئەننای لاواندەوە.***

***پزیشکی مهربانی سەرسپی و بەئەزموون. هەموو خانمێکی سکپڕی بەکچی خۆی دەنوانن , بۆیە ئافەرینی ئەننای کردبۆ ئارامی وبەهێزی.***

***کۆرپەیەکی جەستە خویناوی خستە باوەشیەوە.***

***دەستێکی میهرەبانی چەشنی باوکی بەسەر ئەننادا هانی وپیرۆزبای دایك بوونی لێکرد.***

***ئەم جارەیان ئەننا وناتاشا بۆخۆشی و لەدایك بوونی ئەلکسەندەرا بەدەم زەردەخەنەوە گریان .***

### زستانێکی سەخت

جەستەی شاری ووشککردبوو .

قەراغی پەنجەرەکان لەدیوی ناوەوە سەهوڵی بەستبوو.

شەقامەکان بە تەمێکی سپی سەرپۆشدرابوون , تەنیا بریسکەی تێشکی لایتی ئۆتۆمۆبێلەکان و گڵۆپی سەرشەقامەکان بەکزی دەبینران .

تارمای جەستەی پاڵتۆ ئەستورەکانی پێادەرەوەکان وەك میرۆلەی ناو ئارد لەسپیای بەفرەکەدا دەجولان.

لەچاوەڕوانینی هاتنی میوانی ناتاشادابوون بابوشکە کتریەی ئاوی لەسەرئاگرەکە بەنیازی چا لێانان دانابوو قوڵپیدەدا هەڵمەکەی رووی پەنجەرکانی تەلخ وسروشتی ژوینژینەکەی گەرمکردبوو.

ناتاشا هات و کێکێك و چەند پاکەت بەرگی بۆ ئەلکسەندرا وبۆنێکی خۆشی بۆئەننا چەپکی گوڵی بۆبابوشکا بەدیاری هانی بوو.

زەردەخەنە باوەشێکی بەسۆز بووخۆشەویستیەکانی هەرسێکیانی لەباوەشکردبوو.

شەش چاودەیانڕوانیە ئەلکسەنداری تازە لەدایك بوو.

بابووشکە(دایەپیرە)چاوەکانی لەنێوان رووی ئەننا و ئەلکسندەردا دەگێڕاو بەراوردی لەنێوان هەردوو رووەکەدا دەکرد.

ناتاشا و ئەننا لە دووی لێکچوونی رووی ئەلکسەندەرا و سلوڤیچ دەگەڕان.

ناتاشا : ووتی

- منداڵ ڕووی دەگۆڕێ غەمت نەبێ دەڵی کۆپی خۆتە

ئەننا تێگەیشت ووتی

- ئەگەر هیچشی لە من نەچێت دڵنیابە بە شێوەیەك پەروەردەی دەکەم وەکی باوکی دڕندە نەبێ .

بابوشکە تێگەیشت باوکی ئەم کورپەیە کەسێکی باش نیە.

دەستدرێژیکراوەتە سەر .

یاسای سروشت وایە بەئارەزووی مرۆڤەکان ناجوڵێت نەدەتوانرێ لەڕەوتی خۆی خێرابکریت نەخاوبکریتەوە.ڕیچکەی تەمەنی مرۆڤ بەو خیرایە دەگوزەری کە سروشت پێادەی دەکات.

دوای لەدایك بوونی ئەلکسەندەرا چەند مانگی ئەننا لەماڵ مایەوە ئەوساتانە دەچووە دەرەوە کە پیویستە لە هەفتەکانی دوای منداڵ بوون کورپەکەی بۆ ساتێك بباتە دەرێ تاجەستەی ئاشنای سروشتی سەرمای روسیا ببێ.

رۆژەکانی بەخزمەتی ماڵ وئەلکسەندراوە و خویندنەوە بەسەردەبرت.

کە کۆرپەکەی کەمێك خرۆڵەبوو لای بابوشکە لەماڵەوە دەبوو. گەڕایەوە سەری کار.

زەمەن وەك یاسای سروشت دەڕوات مرۆڤەکان بۆئەنجامی هاوکێشەکان بێ ئۆقرەن.ئەننا دژی ئەم بێ ئۆقرەیە بوو. ئەو بڕوای بەیاسای سروشتی هەبوو.مرۆڤە دڕندەکان وەك درۆی کۆمەڵگا تەمەنیان کورت وئاشکرابوون چۆکدادانیان بەرامبەربەراستی.

***راستێەکی حاشا هەڵنەگرە.***

***بۆبەرنگاربوونەوەی گرفت وپێداویستەیەکانی ژیانی گەلێ کاری گۆڕی.ئەنجام توانی بەئیواران لەزانکو دریژە بە ڕشتەکەی لەبواری سۆسولوگی وکارنامەی لەسەر نەخۆشێیەکانی کۆمەڵگای نۆی سەرمایەداری بە پلەیەکی باش برِ وبوو بە پسپۆڕی نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکان .***

***بابوشکە تەمەنی بۆ کۆتای هەڵدەچوو .***

***تەمەنی ئەلکسەندەرا بەرەو شۆخی دەکشا و ئەنناش بۆ قەیرەی.***

***پەنجەکانی دەستی کردبەشانە ولەبێخی سەری گیرکردو بێخی تووکەکانی سەری بەرزکردوە ژمارەی تووکە سپییەکانی سەری ژمارد.***

***ئاوینەکە ووتی:***

***( دلگران مەبە ئەمە یاسای سروشتە )***

***قسەیەکی دایکی هاتەوەیاد***

***( کچم هەموو قۆناغێکی تەمەن جوانیەکی خۆی هەیە)***

***وەك سیبەری دەوری مانگ . سیبەریکی پیست دەوری چاویان دابوو.نەجگەرکێش ونەڤۆدگاخۆر سروشتی پیستی ڕووی بێ مکیاجیش جوانی سروشتی دەنواند.***

***خانمێکی ناوەڕاست تەمەنی شۆخ مووە سپیکانی قژی شناسنامەی هەمیشە دیاری کەسایەتێەکی بەرێز بوو.جێ پرسیاری زۆرکەس بوو .***

***(بەم هەموو هوشیاری و شۆخێەوە بۆ دەبێ هاوسەری نەبێت؟)***

***ئەم پرسیار پەریەوە بۆ سەرزاری ئەلکسەندرای کچی .***

- دایکە.

بەدەم کارکردنەوە .

- دەڵی چی کچم

- دایە ماوەیەکی زۆرە تۆ تەنیایت سەرنجی کاتەکانت دەدەم دابەشتکردوە بەسەر کاری دەرەوە وماڵەوە.کەبۆاریکشت دەبێ یان دەچیت بۆ شانۆ یان پیاسەی ناوباخچەکان لەتەك من و بابوشکەدا زۆر دەخوێنیتەوە .ئەم هەمو خویندنەوەیە کاتکوشتنە بۆچیێ؟

- کچم مرۆڤ نابێ کات بکوژێت ,

- بۆ ؟

- چونکە کات ژیانە.

- ئەی خویندنەوە کات کوشتن نیە ؟

- نا ...کاتکوشتن نیە خویندنەوە گەڕانە لە دووی ئەو نهێنیانەی هیشتا پێان نەگەیشتووم .

- ئەمەچیە ؟

- ئەمە فەلسەفەی خۆیندنەوەیە .

- دایە ڕۆژێکم نەبینوە , نەبیستوە , بۆ چەند کاتژمێرێك چیژی ژیانی ژنانەی خۆتکردبێ.

- بیرت لەخۆشەویستی کەسێك نەکردۆتەوە . یان وەکی زۆر ئافرەتی شۆخ شەیدای شۆخی خۆتی و پیاویك بەشایستەی جوانێکەی خۆت شك نابەیت ؟

- بیرت لەوە نەکردۆتەوە کەسێك ماچت بکات بەسۆزەوە لەباوشت بگرێ؟ باسی سێکس ناکەم شتێکی زۆر تایبەتیە .من کچی تۆم بەری سێکسێکم نهێنیە وتاخۆت نەیدرکینی ئەوپرسیارە ناکەم.

- حەزدەکەم بزانم . لەژیاندا چەند جار خۆشەیستیت کردوە؟

- کچم وانیە من شەیدای جوانێکەی خۆم نیم .

- لەژیانی گشت مرۆڤێکدا لە میژووی هەر میللەتێکدا نهێنیەك هەیە پیویست نیە لەکاتی خۆیدا نەبێ ئاشکرابێ. پرسیارەکانت جوانن بریندارم ناکەن ومافێکی ئاسایی دایك وکچە.ئاگایان لەیەکتر بێت. یەکجار خۆشەویستیم کردوە.لەتەمنی 17ساڵیدا بۆ یەکەمجار بەخۆشەویستیەوە سێکسم کرد.

- دایە من بەری یەکەم خۆشەویستیتم ؟

- بۆچی پێمناڵێت باوکم کیە؟

دەستی لەکارکەوت وسەری شۆڕکردەوە.هیچ وەڵامێکی بەباش نەدەزانی .بێدەنگ بوو

ئەلکسەندرا کەزانی دایکی تووشی شۆك بوو لەپرسیارەکەی پەشیمان بووە .خۆی بەسەیرکردنی تەلەفزوینەوە دورخستەوە.

پاشماوەیەك بێدەنگی نیوانیان.ئەلکسەندرا چووە ژوورەکەی خۆی دایکی بەتەنیا و بەبێ دەنگی بەدیار تەلەفزوینەکەوە جێهیشت.

لە گیژاوی پرسیارەکان و راستیەکاندا گرمۆڵەبوو.دەبێ رۆژێك بێت ئەلکسەندرا باوکی بناسی چ باوکێك باوکێکی سەرسەری؟

زاڵم کەسێك کەهیچ هەست و رەوشتێکی مرۆڤی نەبێت بەزۆر ولێدان و ئەشکنجە سێکس لەتەك ئافرەتێکی نامۆبکات؟

چەند ساڵە بەرەوشتی جوان وهەستی پاك پەروەردەم کردووەوە ئیستا بزانی باوکی مافیایەکی بازاڕ وچەوسینەری من بووە دەبێ ئەلکسەندرا چ پەرچەکرداریکی هەبێ؟

- ووتنی ڕاستیەکان باشە یان درۆکان؟

ئەمە گلۆڵەیەکی ئاڵوسکاوی بیرکردنەوەی ئەننا بوو .

پرسیارەکەی ئەلکسەندرا ئەننای بەرەوڕووی راستی و مافێك کردەوە کەدەبێت وەك دایکێ ڕاستی بوونی باوکی بدرکێنێ .

سەختی رووداوەکان و پیسی کارەکانی سلۆڤیجی باوکی ئەلکسەندرا . توشی ماتەمینی کردبوو هەمیشە لە شیتەڵکردنەوەی هاوکیشەکەدا بوو.

زیرەکی لەقوتابخانە و رەوشتی جوانی ئەلکسەندرا جوانیەکی سروشتی سەرنجراکیش لەنیو قوتابخانەکیدا پێگەیەکی دیاری هەبوو.

وەك کێژێکی شۆخ شەیدای جوانێکەی خۆی ببوو بەسیرکردنی ئاوینە رۆحی گەنجیتی تینەتی نەدەشکا بۆیە ئارزوی بینی وینەی خۆی بوو بۆیە هەمیشە ئەوداڵی وینەگرتن بوو.

وینە تاقانەکانی لە ئەلبوومێکی تایبەتیدا کۆکردبووە.بەشانازیەوە باسی شەیداکانی خۆی بۆ دایکی دەکرد.دایکشی هەمیشە بەم رستەیە پەروەردەی دەکرد

- کچم هەموو پیاویك درندەنیە.

- هەموشیان لەبەهەشتەوە نەهاتوون .

- ئافرەتیش هەروا هەموو ئافرەتێکی فریشتە نین ولەبەهەشتەوە هاتبیتن .ئێمە مرۆڤین وجیاوازیەکان لەتەك بوونماندا هەیە.

وەك چۆن ناتوانری بە ڕەنگی تاوانی پیاوێك گشت پیاوانی دوونیا ڕەنگی بکەین .لەهاوریتی کورِدا هوشیاربە.رۆحی پیاو کەئاگری حەزی ئافرەت دەیگرێ. نەچاویان بە روونی دەبینێ نە مێشك و رۆح و ویژدانیان بڕیاری راستی دەدەن. تۆ شۆخی دەزانم لەم زەمەندا پیاوانێکی زۆر دەور و خولتدەدەن.

- ئەم ڕستەیت لەیاد نەچێ(تابرۆاکان کەم بن هەڵەکان کەمن)بەپێچەوانەوە.تۆئازادی نابێت ئازادیەکەت ببێ بەهۆی داتەپینی هیواکانت. بڕوا بە هەموو پێاویك مەکە.

ئەلکسەندرا تێگەیشت تەنیا و نەدرکاندی کەسایەتی باوکی چیرۆکێکی هەیە.دایکی یان شەرمدەکات لە گێڕانەوەی یان بێزی نایەت.

ماوەی چەند هەفتەیەك بەسەر گفتۆگۆکەی ئەلکسەندرا ودایکیدا تێپەڕی بوو.

لە هۆڵەکە دانیشتبوون سەیری فلیمێکی کۆنی سەردەمی سۆڤیتیان دەکرد بابوشکە پرخەی خەو لە فلیمەکەی پچراند.

ئەلکسەندەر لەسەر ڕانی دایکی ناسکەخەوێك چاوەکانی نوقاندبوو.

ئەننا بەتەنیا بەدیار فلیمەکەوە دانیشتبوو.بەنەرمی دەستی بەقژی ئەلکسەندرا دەگێڕا لایلایەکی سۆزی دایکانە بوو بۆخەوەناسکەکەی.

ریکلامەیەك فلیمەکەی قرتان وهەواڵی کردنەوەی گەورەترین ئاهەنگی پرۆژەیەکی مرۆی لەشاری سان پیترسبورگ سەرنجی بینەرانی فلیمەکەی ڕاکیشا تا دوای فلیمەکە چاوەڕێ بین.

چونکە ئەننا کەسێکی مرۆی بوو برِیاریدا تا بینی پرۆژەکە بەدیار فلیم و تەلەفزوینەکەوە دابنیشێ.

لەکۆتای فلیمەکەدا بێژەرەکە راستەخۆی لە سەر شاشەکەوە کەوتەدوان .

پرۆژەیەکی مرۆڤایەتی بێ وێنە لە میژووی شارەکەماندا.

کردنەوەی گەورەترین باخچەی منداڵان بەشێوەیەکی مۆدیرن بۆ منداڵانی بێ دایك وباوك و هەژران .

پرۆژەیەك چەندەها منداڵی بێنازتێدا پەروەردە دەکرێ.

پرۆژەکەی هێندە لای بێژەرەکە شیرن ومەزن بوو هەڵویستەیەکی کردو تەراِی نێو دەمی قوتداو بەدەنگێکی هونەری جوانەوە ووتی.

- ئەوی جی سەرنجە خاوەنی ئەم پرۆژەیە مرویە سەرمایەدارێکی بێ منداڵی شارەکەمانە.
- سەرمایەداریك هەموو هیوای منداڵێکە.
- هەموو خەوی خێزانێکی بەختیار وژیانێکی ئارامە.

چاوی کامیرەکان چوونە سەردیمەنی جوانی خانوو وهوڵی بازیکردن و ژووری نووستنی منداڵان کۆمەڵە خانمانی جوانی کارمەند لە هۆڵ وژوورەکاندا دەبێنران لەنێو باخچەیەکی جوانی سەوزدا. لەبەرنرخی ئەم پرۆژە مرۆییە پاریزگاری شار و نووسەر و هونەرمەندا و

***سیاسیەکان وکەسانی دیاری دونیا میدیای شارگشتیان میوانی ئاهەنگی کردنەوەی پرۆژەکەبوون.***

***کەمێك لە تەلەفزوینەکە نزیك کەوتەوە.***

***لەبەرخۆیەوە ووتی سوپاس بۆ خوا هێشتا لەم شارەدا کەسانێك ماون دەوڵەمەندن وخاوەنی هەستێکی مۆراڵێکی جوان بن. ئەو مرۆڤە مەزنە کێ بێ هێندە مرۆیانە بیربکاتەوە ؟***

***بەسۆزەوە بڕوانیتە مناڵە بێنازەکانی روسیا؟***

***پەنجەکانی نێو مۆوکانی سەری ئەلکسەندرا خاوبوونەوە***

***پێش ئەوەی وێنەی خاوەن پرۆژەکە نیشانبدا لەرۆحەوە پاڵی بەچرکەی چاوەڕوانەکانیەوە دەنا بزانی ئەومرۆڤە مەزنە کێ یە .***

***لەشوینەکەی خۆیەوە بوو بەیەکی لە میوانەکان وئامادەبوانی ئاهەنگی کردنەوەی پرۆژەکە ئەم بەرو ئەوبەری ڕێگایەکی باریکی ناوچیمەنی باخچەی ساوایان لەچاوەروانیدا وەستابوون.***

***لەناکاو موچرکەیەك گشت جەستەی لەرزان پەنجەکانی نێو قژی ئەلکسەندرا جمان.***

***هەردووچاوی فراوانکردەوە ملی بۆ بەردەم تەلەفزوینەکە درێژکرد وهەناسەی لەخۆی بڕی.***

***بەبینینی وێنەی خاوەن پرۆژەکە جەسەتەی زریکەی ئازارێك ڕایجڵەکان ویستی هاواربکات.***

***زللەیەکی توندی لێدا بۆ ماوەیەك تاسا.***

***قژی ڕاکێشا .***

ئازاریدا ترس سەرتاپا جەستەی لەگۆخست .

دەستێك هەناسەی لەقورگیا تاساندوە وبەدەستێکی تری دەرپێیەکەی دەدریت و پیاوێکی کەڵەگەتی مەچەك ئەستورو ماسولکەدار بە زۆر سێکسی لەتەکدا دەکات.

ئەو تەکانی شیتی دەدا و ئەنناش لەژێریدا فرمیسکی داماوی دەرژێت .

دەقیژینی وکەس بەهاواری قیژەکەیەوە نایەت پەلدەهاویت و پەلی کەلەپچەکراوە.

هیندە تورەبوو بڕوای بەچاوەکانی خۆی نەکرد ویستی پەرداخە ئاواکە بگریتە تەلەفزوینەکە و وێنەی خاوەن پرۆژەکە لەبەرچاوی وونبکات (سلۆفیچ)ئەو پیاوەی پیش17 ساڵ ئەتکیکردوە.

خاوەنی پرۆژە مرۆیەکەیە باوکی کچەکەیەتی .

سلۆڤیچ سەری سپی وچاویلکەیەکی پزیشکی لەچاو زۆر بەهیواشی و میهربانیەوە سلاو سوپاسی ئامادەبوانیکرد.

ستایش وسوپاسی بینەرانی پەسەنددەکرد.

دوومنداڵی جوانی بێ دایك وباوك چەپکە گوڵێکیان پێشکەکرد ئەویش نوشتایەوە هەردوکیانی لەباوەشکرد ماچیکردن.

چاوەکانی نوقاندن وبۆنی جەستەی هەردووکیانی کرد .

بینەرانی ئەودیمەنە لەسەرشاشەی تەلەفزوینکە چاویان بۆ ئەو دیمەن پڕبوو لەفرمێسك.

کەسانی دیاری شار بەڕێز و بەڕیزەوە تەوقەی سوپاسمەنیدان بۆ ئەوکارە لەتەکدا دەکرد .پیاویك بووبە سمبۆڵی پیاوە باشەکانی شارێك کەهێندەی ووڵاتێك مرۆڤی تێدا دەژی.

گریانکی بێدەنگ تاسانی.لەتەلەفزوینەکەی زیاتر نزیك بووە.دەویست بچێتە بەردەمی سلۆفیچ لەبەرچاوی ئامادەبووان وچاوی کامیرەکان یەخەی ئازارەکانی بگریت چیرۆکی17 ساڵی رابوردووی بۆدانیشتوان ئاشکرابکات.

ئەوشەوی بهێنیتەوە یادچۆن وەك درندەیەك خۆی وپیاوەکانی دەستدریژیان کردەسەری ئەم وناتاشای هاوڕێی.

پەلاماری سنگی داو بۆینباخەکەی ڕاکیشاو زللەیەکی لێدا کۆڕی ئامادوبوان شڵەقا.ڕۆژنامەنوس وفۆتۆگرافەیەکان هیرشیان کردهەر یەکە دەیویست جوانترین وینەی لێدان وزللە وقیژەی ئەننا و زەلليی سلۆڤیچ بگرێ.

دووپیاو پەلی ئەننایان گرت و لەسلۆڤیچ یان دورخستەوە .

لە جیگەی خۆی ڕاچڵەکی و گەڕایەوە نیو شۆینتژینەکەی .

ئاوڕێکی بەلای ئەلکسەندەرادا دایەو وەك بەچاو پێبڵی ئەوە باوکتە.

ئەلکسەرندەرا لەخەوێکی ناسکدابوو.

پەشیمان بووە وکەمێك تورەبوونەکەی ئارام بوە .

ئازارە دەرونیەکانی بوون بە لەرزین ون ائارامیەك چاوەکانی وێڵ وپەنجەکانی بەتووندی بەنێو قژەماش و برنجیکەدا دەگێڕا.

***کۆمەڵی ڕۆژنامەنووس دەوری سلۆفیچ یان دابوو هەرێکە کۆمەڵی پرسیارای بۆ ئامادەکردبوو.***

***لەهەمویان عەجولتر رۆژنامەنووسێکی خانم بوو پرسیارلێکرد.***

***- چ شتك هانیدای بۆئەم پرۆژەیە ؟***

***- هەستی مرۆیم بەرامبەر بەمنداڵ.منداڵان نەوەی داهاتووی ئەم میللەتەن.چ بوونێ لە منداڵ خۆشترە بۆ ژیانی مرۆڤ .دەکرێ لەنێو ئەم منداڵە بێکەسانەدا لەنێو ئەو مرۆڤە بێ لانانەی سەرشەقامەکان چەنددەها کەسی خاوەن تواناو بەهەری تێدابێ وسروشت شانسی پێنەداوون بینە سەرشانوی ژیان و خزمەت بە میللەتەکەیان بکەن .***

***- دەکرێ لەنێو ئەو منداڵە بێکەسانەدا کەسانێکی وا سوودبەخش دروست ببێت گشت میللەتی روس وەك گاگارین و پۆشکین . دەیسکۆفسکی شانازیان پیوەبکات .***

***- ئەم رۆحە جوانە و ئەو بیرکردنەوە پوختەیە هوی چیەمنداڵت نیە؟***

***- منداڵ پیویستی بەدایکی باش هەیە.ڕیکەوتی دایکێکی باشم نەکردوە.لەکۆیە ئەودایکە باشەی من و منداڵەکانم بەختیاربکات؟***

***- یانی زەماوەندت نەکردوە ؟***

***- نەخێر***

***- بۆ ؟***

***- تکایە ئەم پرسیارە زۆر تایبەتیە سوپاس بۆدیدارەکەت***

***کەسانێکی زۆر وینەیان لەتەکداگرت. کوتای بەپرۆگرامەکە هات .***

لەنێو جیگەکەیدا تلیدەداو نەیدەتوانی بنۆێ ساتێك دەنوست وساتیك زلەیك ڕادەچڵەکان.کە وێنەی سلۆڤیچ ی دەهانیە بەرچاوی ڕۆحی تۆڕەی ڕەنگیکی تۆخی ڕووی دەکرد. لە ناکاو لەپشت وینەدەرونیەکی سۆلڤیچەوە. زەردەخەنە پەریاوییەکانی ئەلکسەندەرا.دەبوون بەچرپەو

- دایە بۆ ناتوانی بخەویت .

دووینە دوو ڕەنگ دوو مرۆڤ .وێنەی ناسکی ئەلکسەندەرای جەرگی و وێنەی سلۆڤیچی ئازاردەری.نەیدزانی چاوی لە هیچیان بتروکێنێ.

ووتەیەکی دایکی هاتەوە یاد

( کچم ژیانی مرۆڤ لەنیوان ڕابوردوو و ئایندەدایە.. لەڕابوردو مەترسە با ئایندەدت جوان بێ )

بەیانی لەچونیدا بۆکار کۆمەڵی ڕۆژنامەی کڕی تا بزانی ڕاستی ئەم چیرۆکە لە چیدایە.

کەگەیشتە سەرکار گشت کارمەندانی هاوکاری باس باسی ئەو پرۆژەیەو وکەسایەتی بەرزی سلۆڤیچ یان دەکرد.

هەموو ڕۆژنامەکان بەهێلێکی گەورە و شانازیەوە وێنەی جۆربەجۆری سلوڤیچیان بڵاوکردبووە .

پیاوێك شانازی شارێکە .

سلوڤیچ خاوەنی کۆمپانیای بەرگ.میلوینەری روسی پرۆژەیەکی مرۆڤایەتی .

پێاوێکی بێ منداڵ گشت منداڵە بێ باوکەکانی خۆشدەوی.

***پێاويك بۆ منداڵێك خەو بەداێكێكی دڵسۆزەوە دەبينێ .***

***پرۆژەی داهاتووی پياوە مەزنەكە ..كردنەوەی خانويەكی گەورە. بۆ مرۆڤە پێرە بێەكەسەكانی شار.***

***هيوادارين گشت سەرمايەدارانی رووس .وەك سلوڤيچ ئاورِ لە هەژران بدەنەوە .***

**ئەمە ناونيشانی رۆژنامە و گوڤارەكان بوو .**

**رۆژنامەو گۆڤارەكانی كۆكردەوە.رۆژانە چەند جار دەيخوندەوە.**

**دوای ئاهەنگی كردنەوەی ئەو پرۆژەيە سۆڤيچ چوندجارێك لە ديداری تەلەفزوينيدا وەك ميوانێكی بەرێز بانگيشدەكراو بەسەرنجەوە گۆيان بۆ سەرنج و بۆچونەكانی دەگيرا.لەهەموديداريكدا نهێنێكی ناخی لە رِوويدا دەبينرا كەس نەيدەزانی ئەو وينانە بخوينيتەوە لەئەننا زياتر.هەركەناڵی ئامادەی سلۆڤيچی تێدابوايە ئەننا تا دوا چركەی بەرنامەكە بەدياريەوە دادەنيشت.**

**ئارەزوی بينی وينەكانی وگويگرتنی ووتەكانی بوو. هەستی ئەننا بۆبينين وبيستينی ووتەكانی رِۆژبەرِۆژ لەتورەبوونەوە ترزا بۆ حەزی گويگرتن و بينينی .**

**تێگەيشت سلۆڤيچی ئيستا سلۆڤيچی17ساڵ لەمەوبەرنيە كەسێكی ترە.دەكرێ هەڵەكانی رِابوردووی مامۆستای كارەباشەكانی ئيستای بن.**

**لەم ووڵاتەدا بەمليونەها مرۆڤ باسی كەسێك دەكەن وستايشی كارە باشەكانی دەكەن تەنيا يەك كەس نێهينەكانی ئەوی لايە. نهێنيەك بەدڵنياوە دەست ميديا بكەويت بەملوينەها رۆبل دەيكرن.**

لەتەك خوێدا دەدوا نەیدەویرا ئەم راستیە لای كەس بدركینی.نهێنەكەی لای پیرۆز بوو دەیویست پرۆژە پیرۆزەكانی سلۆڤیچ كاڵنەكاتەوە وكەسایەتی نەڕوشینێ. هەرجۆریك بێت باوكی تاقە كچەكەیەتی كچەكەی ئیمرۆ بێ یان سبەی دەبێت بزانی باوكی كێیە.

لەنێوان خۆشەویستی كچەكەی وكارەجوانەكانی سلۆڤیچدا بیركردنەوەی قەتیس مابوو هەندی جار تووڕەبوونی ئازارەكانی شەوی ئەتكركردنەكەی دەهاتەوە یادو نەچاوی هیچ دیمەنێكی جوانی دەبینی نەمێشكی هیچ ڕستەیەكی جوانی بەرهەم دەهێنا.

لەنێوان توڕەبوونی دەروون وهەستی دایكایەتی ومرۆی بۆ كارەكانی سلۆڤیچ توانای بریادانی قەتیسمابوو.

بریارەكان ئاڵۆسكاو هەڵویستەكان دژوار.

ئیمرۆبێ یان سبەی دەبێ كچەكەم باوكی خۆی بناسێت.تەمەنێكی زۆری لاویم پێشكەشكردوە لەم هەڵچونی تەمەندا ناكرێ گشت سۆزی خۆم بكەم بەقوربانی هەڵەیەكی سلوڤیچ كارەكانی جوانە.

شەیدا ووشەی باوكە لەزمانی رۆڵەیەكەوە.

ئەلكسەندەرای جەركێشم ئەوداڵی كەسێكە پێ بڵی بابە,بەختیاری ئەم دوومرۆڤە كلیلەكەی لای منە.مرۆڤەكان میژووی خۆیان بەدەستی خۆیان دەنووسنەوە.

شەو دڕەنگە ودەنگی تەلەفونێك دایە پیرە و ئەلكسەندرای ڕاچڵەكان ئەنناى لەڕێچكەی بیركردنەوەی دوورخستەوە.زۆرجار هاوریەكانی

ئەلکسەندرا بەشەوی درەنگ تەلەفونیان دەکرد بۆیە نەدایە پیرە نە نەننا نرخی بە تەلەفوونەکەنەدا.

- هەلاو فەرموو کێ قسەدەکات
- ئا ببورە پوری نەم ناسیتەوە خێرە بەم شەوە درنگە تەلەفونت کرد
- دایکت نەنووستوە

ئەلکسەندرا هاوردەکات دایە پورە نانتاشایە

ئەلکسەندرا بەدەنگی پەرۆشی ناتاشا پرسیاریکی گۆماناوی لا دروستبوو . وەڵامەکانی دایکی تەنیا ئا ..نا . بۆ . منیش . بۆچی . باشە . بەیانی.

- هیچ ناکەم لەنێوان کۆمەڵی رێگادا بیرکردنەوەم ئاڵۆسکاوە .
- نا پێم نەوت
- هەمووشتی کاتی خۆیدی .
- بەیانی دەتوانین یەکتر ببینن نازانم تەلەفونت بۆدەکەم شەوباش

تەلەفەنەکەی داخست و ویستی لەپرسیاری چاوە پڕپرسیارەکانی ئەلکسەندرا خۆی قوتاربکات.

ئەلکسەندرا لەم وەڵامە کورت وئامێزە نێهێنیانە و لەدۆزی بێدەنگی وئاڵوزی چاوەکانی وپرژی مۆکانی سەری دایکی .

لەدووی ڕاستیك دەگرا

- دایکە هیچ ڕویداوە بەم درنگە پورە ناتاشا تەلەفونی کرد؟

- چەند پرسیاریکی هەبوو وەڵامم دانەوە
- پرسیارەکانی ئەودرێژووەڵامەکانی تۆزۆرکورت بوون.
- جارجارهەستمدەکرت لەوەڵامەکاندا ترسیکت لێدەنیشت؟
- کچم کاتی خۆی گشت شتێك ئاشکرادەبێت برۆ بنوو.

ڕەش وسپی ڕەنگەکانی تری ژیان یەك تابلۆ دروستدەکەن تەنیا خودی مرۆڤ خاوەنیتی.

ئەلکسەندرا شەیدایە شەیدای زانینی ئەوکەسەیە ژیانی پێبەخشیوە ئەوە تەنیا من نیم ئەمە یاسای سروشتە ئافرەت بێ پیاو ناتوانی منداڵ دروستبکات پیاویش وایەخۆشەویستی دایك وباوك تەنیا کرِینی بەرگ نیە پەروەردی جوان و راستگۆی ژیانە.

من ژیانم بەخشی بەخۆشەویستی ئەلکسەندەر و ئەلکسەندرای کچم .کۆتای ئەم چیرۆکە تەنیا من دەتوانم بینوسمەوە یان دەبێ هەتا ماوم درۆ لەتەك کچەکەمدا بکەم لە سۆزی باوکایەتی بێ بەشی بکەم ئەمە تاوانە و لەتەك رەوشتی مندا ناگونجی.

چ کارێك بکەم خودایە؟

ئاوڕی بەناو ژوورەکدا دایەوە لەنێو کەلوپەل و سوجی خانوەکەدا وێڵی وەڵامی پرسیارەکانی بوو .

بێ ئەوەی بڕیاربدا هەستی پاڵی پێوەدەنا وچەند جارێك گەڕایەوە بۆلای وینەکانی سلوڤیچ و ئەنتەرڤویەکانی دەخوێندەوە.

وینەکانی لە رۆژنامەکان بری و خستییە چانتاکەیەوە هەرساتێك بۆاری هەبوایە وینەکانی لەجانتەکەی دەردەهانی و لەتەك چاوی وینەکانی سلۆڤیچ دا دەکەوتنەدووان.

وێنەی یەکەم :منداڵێکی لەباوەشکردەوە چاوەکانی لەژێر چاویلکەکەوە نوقاندوە تا ئارامی رۆحی بە بۆنی منداڵێکی بێ کەس ئارام بکات .

سایکۆلوجیتی وینەکە ووتی :

ئەم مرۆڤە شەیدای منداڵێکی خۆیەتی.زۆر تینوی بۆنی باوەشی مناڵێکە کە بۆنی جەستەی خۆی هەڵمژی بێ.

وێنەی دووهەم : منداڵێکی لەباوەشەو دیاریکەی پێشکەشدەکات و منداڵێکی تریش لەپشتەوە باوەشی کردوە بە ملی سلوڤیچ دا چاوەڕیی دیاری دەکات.

سایکۆلوجیتی وێنەکە ووتی:

ئەم مرۆڤە زۆر حەزی لە کۆمەڵی منداڵە.

وێنەی سیهەم : دوو منداڵی لەباوشدایە یەکیکیان کچ و ئەوتریان کور . چاوی سلۆڤیچ بە چاوی کامیراکەی ووت نیگای رۆحی چاوم بگۆیزرەوە بۆ ئەو راستیەی من شەیدای باوکی چەند مناڵێکم کچ بیٚ یان کوڕ گرنگ نیە گرنگ خێزانێکی بەختیارە.

وێنەکانی کەوتنەدوان.چاوەکانی سلوڤچین پربوون لەتکا و لێبوردن بەرامبەر ئەوکەسانەی تاوانی بەرامبەرکردون. سایکۆلوجیتی ئەم وێنانە دەڵین تۆ پیویست بە کۆمەك هەیە دەترسی وخۆشت نازانی

هۆی ترسەکەت چیە.منداڵت خۆشدەوی نازانی جوانترین کچی ئەم شارە کچی تۆیە .نووسەر نێت خاوەنی درامایەکی چاو پرفرمێسکی.
دەتەوی ببی بەپاڵەوانێك میژوو ئاماژە بەکردارکانت بکات.
ئەم کارباشانەت حەجە و دەتەوی دەروونت ئارمبکات ئا فەلسەفەی حەج پاکردنەوەی کردارە پیساکانی ژیانە.
گشت سایکۆلوجییتی نیگاکانی چاوی سلوڤیچ بە ئەننایان ووت .
بەرادەیەك لەتەك وینەکاندا دەدوا وا هەستی دەکرد پێکەوە لە قاوەخانەیکدا دانیشتن وگفتوگۆ دەکەن.
لەسەرکورسیەکی تەنیا دانیشتوە قاوەکەی ساردبۆتەوە.
ئەنتەرڤویەکی سلوڤیچ دەخۆێنێتەوە  وێنەیەکی گەورە لەنێوەراستی پرسیار و وەڵامەکاندا چاپکرابوو. فوتۆگرافەکە زۆر هونەریانە چاوی کامیراکەی نزیك گلینە پڕ پرسیار و چیرۆکەکانی سولوڤیچ کردبوو.
چاوەکانی بەزیی وشەرمەزاری و تکای لێدەتکا.
ئەو نەیدزانی ئەم وینەیە دەبێت بە میوانی مێزێکی تەنیا و ئەو کەسە دەیبینی کە پیش $17$ ساڵ ئەشکەنجەی رۆح وجەستەی داوە.
وێنەکە لەبەرچاوی ئەننادا بزووا لەرووی رۆژنامەکە هاتەدەرێ وبەرامبەر بەری ئەننا وەك کۆیلەیەکی تاوانبار وەستا.
ئەننا چاویلکەکەی جولاند وررووی رۆژنامەکەی دوورخستەو سلوڤیچ لەسەرکوریسیەکەی بەرانبەری دانیشتوە. دەپارێتەوە
ئەننا : تۆ پاکی وەك ئەو پەریانەی لەدەوری خوا سەما دەکەن.

***بەپاکی خۆت بەجوانی خۆت لە هەڵەکانم ببورە . زۆر دەمێکە لەتەك ئازارەکانی میژوومدا دەتلێمەوە خۆشم نازانی بۆ تەنیا تاوانەکەی بەرامبەر بەتۆ هێندە ئازارم دەدا.؟***

***چاوەکانی پڕبوون لەئاو دەستی بۆ دەستی ئەننا برد و دەستی نەدایە دەستی . سلوڤیچ دەپارایەوە ئەنناش بە تورەیەوە وەڵامی دایەوە.***

***ڤیژانی و گشت دانیشتوانی قاوەخانەکە راچڵەکین .***

***ئەننا بەهۆشخۆی هاتەوە شەرم دایگرت وبەپەلە قاوەخانەکەی بەجێهیشت.***

***- دەبێ ئەم راستیە بدرکێنم.تۆڵەی لێبکەمەوە؟***

***- تۆڵە لە هەموو ساتێکدا باش نیە .هەندی جار هەڵە پیویستی بە بەخشین هەیە نەك تۆڵە.نا.ناهەموو ئازارەکانی سلۆڤیچ ئەلکسەندەرای کچم بەشێکی زۆری دەمژێ.***

***کچەکەم لەنێوان دووکەسدا دەبێتە قوربانی.قوربانی تورەبوونی من و تاوانی رابووردووی باوکی.***

***ئەم کارە چ کەڵکێکی هەیە؟***

***دەبێ کاریك بکەم کارە باشەکانی سلوڤیچ لکاوی وهەڵویستی مرۆی کز نەبێت .***

***ئیستا ئەوخاوەنی سامانێکی زۆرە دەتوانی خزمەت بەمرۆڤایەتی وبرسی و بلایەنەکان بکات.***

***تورەبوونی ئازارەکان ووتیان نا .***

***- دەچم بۆ دەستگای رۆژنامەوگشت نهێنیەکان دەدرکێنم .***

- نا رۆژنامەکان بزنسی پێوە دەکەن . لەپێناوی خۆیان سیاسیەکاندا هەزاراها درۆ دەکەن .وەك خۆیان گەرکێان بێت چیرۆکەکان دادەریژن گەمە بەچارەنووسی سلۆڤیچ وئەلکسەندرا وکۆمەڵی منداڵی بیّ تاوان دەکەن.پێش گشت کەسێك تیغی تیژی ئازارەکان جەستەی جگەرەکەم بسمی نا ئەمە ناکەم .

- دەچم بۆلای پارێزەر و داوای یاسای لە سەرتۆماردەکەم.

بەڵگەم پێە وپزیشك هەموو شتی راستدەگەینی .

- ئەمەشیان پاش نیە پاریزەرکانیش ئەوەندەی بیر لەپارە دەکەنەوە ئاوڕ لە ئەرکە مرۆیەکان نادەنەوە.ئەوان بۆ پارە هەزار درۆ بۆ تاوانباردەکەن .

- ئەمەشیان باش نیە

- بە ئەلکسەندەرا دەڵێم با بچێت بۆ بیرۆکەی باوکی و خۆی پێبناسی.

- هەروا بە ئاسانی ؟

- نا

لەنێوان دووخۆشەویستی ووندا خۆشەویستی ئەلکسەندەرا بۆباوکی و خۆشەویستی سلوڤیچ بۆ کچەکەی تەنیا پردێك هەیە ئەویش ڕەوشت و ویژدانی منە.

ئەم پردە دەبێت هێندە پتەوجوان وڕازاوە بێت.هیوای دوو مرۆڤی چاوەڕوان لە ئامێز بگریت .

لەدوورەوە چاوم لێە سلوڤیچ لەسەر پردی ڕوباری هیوای ساردی لە زستانی بێکەسی وتەمەنیای هەلچونیدا وەستاوە ڕووبارەکە تارمای

هەڵمێکی تۆخی لێهەڵدەسێ تروسکەی هیواکانی تیاوونە لەنیوتەمی ساردی ڕووباری ژیانەدا.چاوەڕێ ژوانی کەسێکە لەژیانیدا نەیبینەوە.
ئەلکسەندەرای کچیشم لەمسەری پردەکەوە لەترسی سەرمایەکی نادیار لە پاڵتۆیەکی تووکندا خۆی مەلاسداوە , چاوەڕێ ژوانی جەستەی ئەو تارماییە گەرمەیە کەگەرمی رۆحی باوکێکی پێدەبەخشێ؟
ئەلکسەندەرا نازانی باوەشی ئەو تارمایە ئارامی پێدەبخشی یان باوەشێکی درکەزی هەیە.ئەو وێڵی باوکیتی بۆ ئەو گرنگی نیە .کێ باوکیتی گرنك بزانی پیاویك هەیە پێ بڵی باوکە.
ووشەی باوك ودایك موسیقایەکی رۆحی هەیە.
دایکم لەسەرتای زمان پژینمدا ووتی کچم.
- تەنیا بە ووشەی دایە بانگم بکە
ووتم
- بۆ ؟
ووتی
- کەبووی بەدایك دەزانی ووشەی دایە چەند رۆحی دایك ئارام دەکات.
هەروەها باوکیش
- ووشەی کچەکەم و کوڕەکەم تەمەنی دایك وباوك درێژ.
چرکە عەتراوی دەکات
- ئەوە تەنیا دایك وباوکە دەزانی چ سۆزیك باوەشی روحیان دەگرێت کە بوویت بەدایك لەم ڕاستیە دەگەیت .

كەدەنگی دایەی ئەلکسەندەرا دەبیستم گشت ئازارەکان ساریژدەبن. چ تاوانە من ببم بەهۆی چەوسانەوەی ئەو مرۆڤەی چاوەڕی ووشەی باوکە . سەیرێکی جوانترین وێنەی سلۆڤیچی کردوو.

ئەو ساتەی هاتەوە یاد کە بۆجاری دووهەم بێ لێدان و ئازار بە سۆزەوە سێکسی لەتەکدا کرد و ماچی لامل و زمانی بەپشتیدا دەخشاند تەکانەکانی سۆزی تیدابوو . تەکانەکانی تەکانی کەسێکی وێڵی خۆشەویستی بوو .

دەکرێ ئەویش قوربانی سروشتی سیاسی و ئابوری کۆمەڵگای داتەپیوی دوای کۆمونیست بێ ؟

بۆنامرۆڤەکان بە پاکی لەدایك دەبن و سروشتی کۆمەلایەتی پیسیان دەکەن.

ملی نابوو بەلارە و چرکەکانی قورس ببون

نەیدەزانی چ بڕیاریکبدا .

دەبێ وابێ بڕیاری خێرای هەڵەیە

وەك گەرەکی بێ کەمێك مێشکی لە ماندووی بیرکردنەوە بحەونێتەوە پێکی شەراپی سوری تێکردوو.

بەبێ دەنگی لە هۆڵەکەدا دانیشت.

لەتەك هەر تنۆکی شەرابی تاڵ سەری زمانی بەتاڵێکی خۆش پاراو دەکرد ووشەیەکی نۆی لە مێشکی لەدایك دەبوو .

ڕۆژنامە وگوڤارە کۆنەکانی پەرشوو بڵاوکردبووە جارجارە لەدڵەوە حەزی بەبینی وینەکانی سلوڤیچ دەکرد .

***سەیرکردنی قوڵای ئاسمان هێزێکی زۆری بەرۆحی ئەننا دەبەخشی . پیوابوو سنوری ژیان زۆر فراوانترە لەسنوری گرفتەکان بۆیە هەرکاتێك گرفتێکی هەبوایە دەیسپارد بە سنوری بێ سنوری ئاسمان.***

***ئەم هێزە سایکۆلوجیە لەزۆر ساتدا کۆمەکی پێکردبوو.***

***تاکێ لەپەنجەرەکەی کردەوە پەردەکەی گری دا . دەستی خستبوە ژێر چەناگەی ولە پەنجەرەکەوە دەیڕوانیە قوڵای ئاسمان.***

***گەرایەوە بۆ دیدار و هاوڕێ پێکە شەرابەکەی . پیکەکەی هەڵگرت و زۆر بە تامەوە چەشنی لێو بۆ لێوی پیاویکی عاشقی بنێ لێوی پەرداخەکەی خستە نێوان لێوانی و وەك شەرم لە حەزی بکات بە تیلەی چاو ڕوانیە جوانترین وینەی سلۆڤیچ . هەستیکرد تامی لێوی شەرابەکە تامی مژینی لیوی پیاوی لێدی . زۆر هوشیاربوو زۆر دەمێکە جەستەی زریکەی بۆ بۆنی جەستەی پیاویك کردوە ئامادەنەبووە خۆی بداتە دەست حەزە بایلۆژیکانی .***

***زۆرجار لە قۆڵیی خەویکی ئارمدا زریکەی حەزی سیکس ڕاچلەکاندوە خەوەکەی شڵەقاندوە .ئەوە تەنیا ئاشنای پەنجەکانی خۆی بووە . بۆیە پەنجەکانی بۆنی جەستەی پیاو و ئامێزی پیاوی پێنەبەخشیوە . پەنجەکانی تەنیا زمانە تووتەی ناوگەڵی پێ ئارامکردوە .***

***قومێکی قووڵی لەشەرەبەکەدا و چاوەکانی وینەی لێوی سوڤیچبان خستە سەر لێوی پەرداخەکە کە شەرابەك سەری زمان و گەروی تەڕکرد ڕۆحی شەرمی شکاو وەك گەرکی بێ لێوی سلۆڤیچ بمژێ سەری زمانی زۆر بەحەزەوە بە لێوی پەرداخەکەدا هانی .***

رۆحی بەم ماچە خیالاویە ئارام بوو. چوە ئەدموسفێرێکی ڕۆمانسیەوە. نەك ناوگەڵی گشت پیستی جەستەی گەرمڕاهات . رۆحی ووتی زۆر دەمێکە چاوەڕێ مژینی بۆنی نێرینەیکم . تۆ بەتاوانی شەرم تاوان بەرامبەر بەمنی رۆح و جەستەی خۆت و یاسای سروشت و خوا دەکەیت . ئەم سەرپۆشە شەرمە فرێدە و با پێکەوە بچینە ئامێزی ئەو پیاوەی نە تۆ دەزانی و نە ئەوە ئێوە هەردووکتان لە دورەوە شەیدای یەکن . تۆی قەیرە ئافرەت تەمەنیکە چاوەڕێ پیاویکی رۆحت بلاوینی . شەرم هەموو پرۆژە رۆحیەکانتی کوشتوە , سلۆڤیچ یش پەشیمانە لەو تەمەنە جوانەی رۆژانە پیشکەش بە سوپایە خانمی جوانی بێ ڕۆح کردوە . هەردووکتان تاوانبارن . نازانن بۆ ئەم تاوانە درێژەی هەیە. ئەوە ئیستا خوا هاتۆتە خواروی لەدەوری ئەمشارە چاوەڕێ ئەوە دەکات ئەو دوو مرۆڤەی قەدەریکە تاوان بەرامبەر بە خۆیان دەکەن . ئەم ریکەوتەی بۆ سازکردون .هەنگاو بنێ .تورەبوونت ویڵبکە نەك تۆ سلۆڤیچ ئەلکسندەرای جەرگیشت بەختیار دەکەیت .

ووتەکانی دایکی چارێکی تر لە میشکیدا زرنگایەوە ووتی

( کچم لە ڕابوردوو سڵ مەکەرەوە با ئیاندەت جوان بێ )

( کچم مرۆڤەکان خۆیان میژووی خۆیان دەنووسنەوە )

لێوی پەرداخەکە لە نێوان لێوەکانیدا بوون بە لێوێکی گۆشتن و تامێکی نۆی پیدەبەخشی . چونکە لێوی سلۆڤیچی نەمژی بوو

نەیدەزانی ئەو تامە لێوە نۆیە بۆ خۆشە . رۆحی لێوی ڕەقی شوشەی پەرداخەکەی کردبوو بە لێویکی زبری سلۆڤیچ .لەرۆحەوە دەیمژی.

ئەلکسەندەرا لەخەو بەئاگابوو بۆ تەولێت چوو.

چاوە خەواڵوەکانی هەڵگڵۆفت بینی دایکی بەتەنیاو لەژێر تیشکی گلۆپێکی کز پێکی شەراب بەدەستەوەیە وکۆمەڵی رۆژنامە و گۆڤاری پەرشوڵاوی لەدەوری پەرش بوون.

لەووردکرنەوەی گریکۆرەی پرسیاردا گیری خواردوە .

بەئەسپایەکی بێخشپە چەند هەنگاوی لەدایکی نزیك کەوتەوە.

کەمێك بە پێوە لە پشتی دایکەوە وەستا جارێکی تر وزەی بەچاوە خەولۆکانی دا .

بەهێمنی دەستی خستە سەر شانی دایکی

- دایە گیان ئەوچیتە بۆ ناتوانی بخەوی؟

ئەننا ئاورپیدایەوە.

بۆئەوی ئەلکسەندەرا وینەی باوکی نەبینی.گۆڤار و رۆژنامە کۆنەکانی کۆکردەوە.

ئەلکسەندەرا وێنەکانی سلۆڤیچی لەتەنیش دایکەوە بینی .

- دایکە ئەو رۆژنامە و گوڤارانە کۆنن. هەواڵەکەش بەسەرچووە.

چووە باوشی دایکیەوە سەری نوساند بەسنگیەوە وینەیەکی سلوڤیچی گرت بەدەستەوە.

- دایە پیاویکی جوانە بە پێکەنینەوە شەیدای نەبوویتی ؟

*له قوتابخانه زۆرله هاورێکانم دەیان گووت خۆزەگه باوکی ئێمه دەبوو.*

*پیاوێکی قەیرەی جوانی بێ خێزان ومندالّ دەبێ چەند خانمی قەیره شەیدا ببن.*

*ئەننا به میهربانیەوه رۆژنامەکەی لەئەلکسەندەرا وەرگرت ووتی:*

*- جگەرەکەم زۆردەمێکه من شەیدای ئەوەم تۆ ئەو مرۆڤه بیت کەمن گەرکمه.بۆیه تەمەنێکی زۆرم بەتەنیای بەسەربردوه.*

*- خوا گەورەیه کچم*

*- دایه دەزانی زۆردەمێکه ئەم ڕەستەیه لەتوی دەبیستم ؟*

*تۆ ئەو کەسەش نیت شەیدای کەنیسه بیت ؟ڕوژێك نەمبینوه بچی بۆ کەنیسه؟*

*- برواناکەم هیچ دیندارێك هێندەی تۆ ئەم رستەیه بەکاربهینیّ؟*

*- کچم خوا نه لەکەنیسەیه نه لەمزگەوت.ئەم ڕستەیه بنەمایەکی سایکۆلوجی هەیه.ڕاسته من سەر بەکەنیسه وهیچ دینیك نیم.*

*لێ ڕێزم بۆ بۆچونه جیاوازەکان هەیه.*

*من پەروەردەی ڕۆشنبیری دایك و باوکێکی زۆر هوشیارم.*

*جگەلەوه تۆ دەزانی من دەرچوی کۆلیجی سۆسۆلۆگیم ؟*

*بەشێکی خۆیندنەکەم سەرقالّی سایکۆلۆجیتی کۆمەلّگا بوین .*

*.سایکۆلۆجیتی گشتی کۆمەلّگا دەتوانرێ لەخوێندنەوەی سایکۆلۆجیتی تاکێکەوه بخوێندرێتەوه .*

*یەکێ لەو بابەتانەی زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم هێزی سایکۆلۆجی مرۆڤ وکۆمەلّگایه. بەرامبەر به گرفت و بڕیاری چارەنوسدارەکان.*

- دایە سایکۆلوجی چ پەیوەندی بە بوونی خواوە هەیە .

- کچم هەموشتی پەیوەندی بەبوونی سروشتەوە هەیە.ئێمەی مرۆڤ بەشێکین لەسروشت.ئێمە خاوەنی سروشتین و سروشت خاوەنی ئێمەیە سروشت وئێمە یەکتری تەواودەکەین.

- راستیەك هەیە ئەویش تەمەنی ئێمە وەك مرۆڤ دیاریکراوە لە لایەن سروشتەوە لێ ئێمەی مرۆڤ ناتوانینی تەمەنی سروشت دیاریبکەین.

- پرسیارێکی بێ وەڵام هەیە سروشت خوایە؟

- خوا سروشتی دروستدکردەوە یان سروشت خوای دروستکردەوە؟

- کەس ناتوانی وەڵامی ئەم پرسیاربداتەوە .

هەموو ئاینەکانی ئەم دونیایە باس لەبوونی خودایەك دەکەن.

کەسیش خوای نەبینوە.

- جیاوازی هزری لەنێوان ئاینەکاندا هەیە.

- پەیوەندیەکی زۆر لە نێوان دەقی پەرتووکە پیرۆزەکانیشدا هەیە - واتە.هەرئاینی لەزەمەنێکی تایبەتیدا پەیدابووە.جیاوازی تەمەن زەمەن وشوینیان.جیاوزای خۆیندنەوەی فەلسەفەی بوونی خوا وسروشتدا هەیە.

فەیلەسوفێکی ئەڵمانی هەیە زۆرم خۆشدەویت ئەویش نیچەیە.

کەسێکی زۆر هوشیار بوو بیرکردنەوەی سەدەیەك لەپێش تەمەنیەوە بوو.

(دەڵێت پێم بڵێ پیش لەدایك بوونت لە كۆبويت . منیش پێدەڵێم دوای مردن دەچی بۆكۆێ ).

= ئەمە یانی چی ؟

= ئەمە پرسیاریكیزۆر هوشیارانەی سروشتە تائیستا هیچ كەسێك وەڵامی بۆ نیە .

- دایە ژمارەی ئاینەكان چەندەیە ؟

- زۆرن گرنگترینیان جولەكە , فەلە و ئیسلامە .

- ژمارەی خواكان ؟ چەند خوا هەیە ؟

= بەپێ گۆڕینی هوشیاری كۆمەڵگا زەمەنەكان زۆرن .

- یانی پێش ئەم ئاینانە ئاینی تر نەبووە؟

بێگومان هەبووە لێ باوكی ئەم سێ ئاینەی ئیستا بەفراونی بونیان هەیە ئاینی زەردەشتیە

- زەردەشتی ؟ ئەمە چیە دایە ؟

- ئاینێكی زۆركۆنە سەرچاوەی ئیسلام وفەلە وجولەكەیە.تەنانەت لەیەكێك لە وانەكانی قورئاندا ئەوڕاستیەی دركاندوە.

- ئەی خوا لە كۆدایە ؟

- لەرۆحی مرۆڤدایە .

- ئەی رۆحی مرۆڤ لە كویدایە ؟

- خوادەزانی .

- لەمەشدا پەنات بردە بەر خۆا؟

- بێگومان کچم کەمرۆڤ وەڵامی پرسیارێکی پێنەبوو دەڵێت خۆا دەزانی . کە تواناى چارەی گرفتێکی نەبوو دەڵێت خوا گەوریە . خوا ئەوهێزە دەرونیە گەورەیە کە مرۆڤەکان بەهێز دەکات.

- من تێناگەم

- دەبێ تێنەگەیت چونکە فەلسەفەی بون ونەبوونی خوا وا بەئاسانی یەکالآنابێتەوە . لەیادمە لەقۆناغی زانکۆدا هاورپیەکم هەبوو خوای خستبوە ژێر پرسیاری حەقیقەتەوە.بۆچونی ئەوهاورێیە مشتومرێکی زۆری لەنێو مامۆستا وقوتابیاندا دروستکرد.چەند قوتابیەکی ڕادیکاڵی ئیسلامیش لەتەکماندا دەیانخوێند چونکە ئەو بۆچونە زۆر زانستانەبوو هیچ لە ئاینەکانی زوير نەکرد.

- چۆن ؟ ووتی چی ؟

- دەڵێ (ئەگەربوونیاد و دەرکەوتنی ئاینەکان لەسەر بونیادی ڕاستی ببوبێتن و لە پیناوی بەختیاری و سەرفرازی مرۆڤ و دادپەرەوری کۆمەڵایەتیدا هاتبێتنە بوون . کەواتە لەئاینەکان پیرۆزتر(ڕاستی ووتنە)بەم پێیە هەر ئاینی دژی ڕاستی ووتن بێ . ئەوە دژایەتی کرۆکی خۆی دەکات( گەر ڕاستی بونیادی بێ) لەبەر ئەوەی لە کرۆك و بونیادی ڕاستیدا بزوتنەوەیەکی بێ ئۆقرە هەیە کە هەمیشە بە دوای ڕاستر و ڕاستردا دەگەڕێ , بۆیە لۆژیکی ڕاستی چاو لە هەڵەی هیچ ئاین و فەلسەفەو کەسێك ناپۆشێ).

- بۆچونێکی زۆر جوانە

- له ژیاندا کۆمەڵی پرسیار و فەلسەفەی ئاڵۆسکاو هەیە پیویستی بە توژینەوەی زۆر هەیە .

من پێیان دەڵێم فەلسەفە ئاڵۆسکاوییەکانی تەمەن .

- ئەمە چیە؟

- ئەم چەشنە پرسیارەی تۆ.منیش لەتەمەنی لاویدا لەکاتێکدا بابەتێکی نۆیم دەبیست پرسیارم لە دایکم دەکرد.

فەلسەفە ئاڵۆسکاوەکان

1- خوا

2- مەبەستی بوون

3- سیستەمی مۆراڵی جیهان

بۆ هەریەکێك لەمانە دەتوانرێ زۆری لەسەر بووترێ وبنوسرێت . ووتنی زۆر گرنگ نیە گرنگ چڕکردنەوەی بابەتە .

خوا : هەرکەسێك هەرمەزهەب و فەلسەفە و فەیلەسوف و پێغمبەرێك هەر هونەرمەندێك گەرەکی بێ وێنەیەکی خوا بکێشێ.

بێ چەلەحانێ هەڵەیە.

خوا تەنیا مەزەنەیە.مەزەنەکەش لەبیرکردنەوەی مرۆڤدا لەئاست دروست بوونی بوون و ژیان وسیستەمی سروشتەوە دروست بووە.

پیمووتی کەمرۆڤ وەڵامی پرسیارێکی پێ نەبوو یان دەبێ درۆ بکات یان زیکزاك لە وەڵامدانەوە.

یان ووتنی مەزەنەیەك.

بۆ وەڵامی بوون وشێوەی خواش هەروایە چونکە هیچ کەس ئەو بوونەی نەبینیوە کە هەرلسورێنەری ئەم بوونەیە .

ئەگەر بیرکردنەوەمان لە ئاست هێزو شێوەی خوادا گردبکەینەوە ناگەینە هیچ ئەنجامێك.

وەلێ ماڤ هەموو مرۆڤێکە ئەو پرسیارە لە هەڵسورێنەری ئەو سیستەمە بکات کە ڕۆژانە مرۆڤ بەچرکەکانی ژیانی دەیبینێ.

چۆن ئەم بوونەهاتووتە بوون؟

ئەگەرمەتریالێیانە بڕوانینە ئەم پرسیارە بوونی هیچ مەتریالێك بێ مەتریالێکی تربوونی نیە.

من مسوڵمان نیم لێ ئیسلامەکان میتافیزیکیانە بەناوەڕۆکێکی مەتریاڵیان وزانستیانە و سروشتیانە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لەقورئاندا جەختیان لەسەر دروستبوونی مرۆڤ لەسەر ئاستی بوونی دوو ڕەگەزی نێر و مێ کردۆتەوە.ئەمە جوانترین دەقی ئیسلامە.

دوای چەندساڵ مارکس کەڵکی لەبوچوونی ئیسلامەکان وەرگرتووە.

خوا لای موسوڵمانەکان وەك قەبارە وەك شێوە بوونی نیە.سمبۆڵە سمبۆڵی هێزێکە کەلە شێوەی بوونی نیە.بەڵام هەرخۆیان دەڵێن خوا نێرە مێ نیە. کۆمەڵێ ناویشیان لێناوە ئەم بۆچونانە دژ بەیەکن هەروەها مسیحیەکانیش دەڵێن خوا نێرە باوکی مسیحە.

من بڕوام بەمەنیە ئەم فەلسەفەیە هەستی پیاو سالاری دایڕشتووە.

یانی پرسیاری بوونی خوا لەهەرئاینیك بکەیت وەڵامێکی ڕاستت پێنادات.ئەگەر بە پێی پێوەری فەلسەفەی ئیسلام بڕوانیە وەڵامی

***بوونی خوا و تواناکانی لەزۆرجاردا ئیسلام کارە خراپە نامرۆیەکانیشیانی خستۆتە پاڵ خوا,***

***خوا خاوەنی جەنگی پیرۆز نیە .***

- ***بۆ***
- ***چونکە خوا مرۆڤەکانی بۆ ژیان دروستکردوە نەك یەك کوشتن.***
- ***جەنگ ویستی خوا نیە ویستی مرۆڤەکانە.جەنگی پیرۆز تەنیا بۆ شرعیتدانی ویستی دەسەڵاتە دیکتاتورەکانە . ئەمە تاوانە لەپاکی وپیرۆزی خوا.***

***ئەگەر سەرچاوەی هەموو هێزێك بوونێك بێ؟***

***ئەی سەرچاوەی بوونی هێزی خوا چیە و لە چ سەرچاوەیەکی هێزەوە هاتووە ؟***

***ئەگەرئەو هێزوجوانی وتوانایەی ئێمەی مرۆڤ هەمانە بەخشینی خوا بێت ئەی چ بوونێك هێزی بەخوا بەخشیوە؟ کەواتە بە زنجیرەکردنی ئەو هێزە زنجیرەیەك خوا هەیە؟***

***تا بیریشی لێ بکەینەوە ناگەینە هیچ ئەنجامێك.کەسانێکی زۆر وێڵی وەڵامی ئەوپرسیارەن .***

***بەبۆچونی من خوا بوونێکی پیرۆزە . بوونیشی بۆ سایکۆلوژیتی مرۆڤ وکۆمەڵ پیویستە.لە زمانی گشت نەتەوەکانی ئەم دونیایەدا دوو ووشە هەن زۆر پیرۆزن***

***یەکەم خوا ... دووهەم دایك.***

- ***بۆ ؟***

- چونکە لێکچونێ لە نێوان خوا و دایکدا هەیە .
- چیە ؟
- هەردووکیان مرۆڤ دروستدەکەن.
- من دایکمم خۆشدەوێت .دڵنیاشم تۆش منت خۆشدەوێت
- وایە دایە گیان بەقوربانت بم (ماچیکی کرد) تۆ ژیانت بەمن بەخشیوە .بەبێ خۆا من ناتوان ژیانت پیبەخشم .من وخوا هەردووکمان تۆمان دروستکردوە .

باوەشی بەدایکیا کردو بەدەم پێکەنینەوە ووتی

- سوپاس بۆ تۆ و خوا دایەگیان

ئەنناش سەری ماچکرت ووتی

- کچم برۆ بنوو منیش ماندوم .

کۆتای بە گفتوگۆکان هات ئەلکسەندەرا پرسیارەکانی لە تەنیایی دایکی ووینەکانی سلۆڤیچ لەبیرچووە.

گشت رۆژنامە و گۆڤارەکانی پێچاپەوە.

لەدارشتنی پلانێکی هوشیارانەدابوو.

باوك وکچێك بەیەك ئاشنابكات.

ئەمەش سەربەرزیە بۆ من بۆكەسێك رۆحێكی پاك ورێكەوتێكی چاوەڕونەکراو.ببێ بەپاڵەوانی ڕۆمانێکی نەنوسراوە و سەرگورشتەی ڕووداوێکی دوودیوی جوان دوو مێژووی جودا.

مرۆڤەکان بەپێ قوناغ وسروشتەکان دەگۆڕین.

سلوڤیچی تەلەفزوینەکە ئەوکەسە نەبوو کەمنی ئەشکەنجەدا.

یەکەم ژەم زۆر ئازاری دام دووهەم ژەم زۆر میهربان و بە سۆزەوە هەوڵی ماچکردن وسیکسی ئارامی دەدا.سروشتی بایلۆژیتی پیاوان وایە کە بێ سێکس بوون نەمێشکیان کاردەکا چاویان تەنیا ناوگەڵ ومەمك ولەشی ئافرەت دەبینێ .کاتیکیش لەسێکس تەواودەبن دەبن بەمرۆڤێکی تر.

ئەو ژەمی یەکەم وەك ئاژەڵ پەلاماری دام.دیاربوو ماوەیەکی زۆر بوو بێ سێکس بۆیە لەمرۆڤەوە ببوبەدڕندەیەك .

هێندە شەهوەتی ڕژانە ناوگەڵمەوە نەك نێوان سمتەکانم پەڵەیەکی فراوانی لەسەر دۆشکەکە تەڕکرد.

کەدەنگی هاوار وقیژەی ناتاشی بیست . دیاربوو پیناخۆش بوو ڕویشت پاش کەمێك ودەنگی ئەشکەندانی ناتاشا کپبوو.

منیش بەڕووتی بەدەمدا پاڵکەوتبووم تەنیا ئەو دیمەنی سمت و پشت و جەستەی ناسکی منی دەبینی .چاوەکانم نوقاندوبوو سروشتیە تەنیا پیشەوە دەبینم. نازانم ئەو چۆن جەستەی ڕووت وسمتی خڕ و پشتی ڕوتی منی دەبینی ؟ دڵنیام لەوەی پێش 17 ساڵ لەمەبەر من خانمێکی گەلێك شۆخ بووم بۆیە سلۆڤیچ لەنێو ئەو هۆڵە پڕخانمانەدا منی هەڵبژارد.

لەترسا جووڵەم نەکرد ئەوسا ئەو تەمنێکی کەمی هەبوو ئیستا پێاویکی بەتەمەن وخاوەن تاقیکردنەوە و سامانێکی فریە تێگەیشتوە سامان ئەگەرهوشیاری لەتەکدا نەبێت.تەمەن درێژناکات مرۆڤ بەختیارناکات.

***ئەوەش هوشیاریە مرۆڤ هەڵەکانی خۆی بکات بەمامۆستای وانەی جوانی ژیان.***

***ئا منیش پرسیاری ئەو رۆژنامەنووسە دەکەم بۆ تائیستا ژنی نیە؟***

***خێزانی نیە؟***

***پیاویکی ملوینەروخاوەنی گەورەترین کارگەی بەرگی.***

***بەداها کەس کاری بۆ بکەن دەکرێ لەروسیای پڕئافرەتی شۆخدا بێ ژن بێ؟***

***ئەمانە گشتی نهێنی و تەنیا خودی خۆی دەزانی .***

***پرسیارەکانی هێندە زۆربوون تاپیڵوەکانی چاوی قورس نەبوون.بیری لە نوست نەکردەوە.***

***چووە جیگەی نووستنەکەی .باوەشی بە پرسیارەبێ وەڵامەکاندا کردوو خەوی لێکەوت.***

**دایکی سلۆڤیچ**

**پیرەژنێکی دڵفراوان ونمونەی دایك و ژنی ڕەسەنی ڕوسی بوو.دڵسۆزی بۆهاوسەر و خۆشەویستی بۆ تاقە کوڕەکەی لە سنوری ئاسایی تیپەڕیبوو .**

**تا مردنی باوکی سلۆڤیچ بەدیار جەستەی دەدەداری میردەکەیەوە لە شوینێژێنێکی کۆن و لەگەرەکی هەژارانی شاردا ژیانی دەگۆزەران.**

**بۆئەو خانمە گرنگ نەبوو کوڕەکەی یەکێکە لە ملیونەرەکانی شار بۆ ئەو گرنگ کوڕەکەی چ مرۆڤێکە.**

**سلۆڤیچ کردبووی بە بەرنامە هەموو ڕۆژێکی شەمووان سەردانی دایکی دەکرد .**

**بەگەیشتنی مارسیدسە ڕەشەگران بەهاکەی کۆمەڵی پیاوی پاسەوانی گەرەکی هەژرارەکان دەشڵەقا**

**لە ڕۆژێکی شەمدا سلۆڤیچ و پاسەوانەکانی گەیشتنە کۆڵانەکەی گەرەکی دایکی .**

**پرسیارێکی گرنگ بوو پێاویك ئەم هەموو سامانەی هەبێ لەجوانترین ڤێلادا بژی و دایکی لە شوینێژینێکی کۆن و گەڕەکی هەژاراندا.**

**جێ سەرنجی گشت کەسێك بوو.**

بەپلیکانە کۆن وپیسەکەی نێوان ودیوارە داروخاوەکاندا بۆ شۆینێژینەکەی دایکی سەرکەوت.

دیاری دەستی تەنیا کێکێك و چەپکێ گوڵ بوو.

پلاکی جەرەسی شوینێژینەکەی دایکی لەکار کەوتبوو.

بەسەری پەنجەکانی لەدەرگاکەیدا.

ئەوشوینێژینەی کەبەشێك لەتەمنی دایکی لەژوورەکانیدا بە ئەرشیف بەخشی بوو.هەناسەی منداڵی سلوڤیچی لەباوشگرتبوو. دایە پیرە هێندە خێزانەکەی خۆشدەویست دوای مردنی هاوسەرەکەشی جل وبەرگ وپیڵاوەکانی تورنەدابوو.پەرتووك و پێڵاوی بازیکردن وبەرگە منداڵیەکانی سلوڤیچی وەکی خۆی پاراست بوو.

دەرگاکەی کردەوە.

کەسلوڤیچی کوڕی بینی ڕووی وەرگێڕا و پێخۆش نەبوو سەردانی بکات.

ویستی دەستی دایکی ماچبکات نەهێشت.

- دایەگیان تەندروستیت چۆنە؟

وەڵامی نەدایەوە.خۆی بەپاکردنەوەی چیشتخانە وماڵەکەوە سەرگەرمکرد.

لێنزیك کەوتەوە

ویستی سەری ماچبکات

- بۆ سەرم ماچدەکەی ؟

- پێمناڵێت تۆ چۆن مرۆڤێکی؟ ئەوداڵی چیت؟

دەنگی تورەبوونەکەی دایە پیرە لەپەنجەرکەوە گۆی قۆڵاغی کۆڵانەکەی پڕکرد.پێرژن وپیرەمیردەکانی دراوسێ بێدەنگ بوون.
منداڵە عەجوولەکان لەپاسکیل لێخورین وکچۆلەکان لەحۆلانەکان هاتنە خوارەوە.لەدەوری مارسدیسە ڕەشە گرانبەهاکە وپەنجەرەکەی دایکی سلوڤیچەوە گردبوونەوە گۆیقولاغی ئەنجامی تۆرەبوونی دایە پیرە و.پاڕانەوەکانی سلۆڤیچ بوون .
- لەژیانتدا هەموو سەرسەریکیت کرد.ئیستا تەمەنت بەرەو ژوور دەڕوا خۆت نازانی چی دەکەیت؟
- تۆمنداڵی من ئاموژگاریت بکەم؟
- سەرت سپی بووە تۆ تەنیایت ؟
- ڕۆژێك دێت منیش دەمرم؟
- باکەسێکت هەبێ دەستی تەمەنی پیریت بگرێت.
- کورڕم سامان هەموو شتێك نیە.هەمووشتیکت هەیە نەتیا شتیکت نیە کە پیویستە هەت بیت ماڵی بێ منداڵ وەك ماڵی بێ پەرتووك وایە.
بیرك لەخۆت ومنیش بکەرەوە ئەم شارە پڕە لەئافرەتی باش تا نەمردوم حەزەکەم تۆ ببی بەباوك ومنیش بابوشکە ( نەنك).
- بزانە لەم گەڕەکەدا تەنیا من بێ کورزام؟
- منداڵێك نیە ووشەی بابوشکەم(نەنکم) پێ ببەخشی. ساتێك پێکەوە لەباخچەیەکدا پیاسە بکەین .
چاوەکانی پڕبوون لە ئاو و بەپەنجە چرچرکانی ئاماژەی چوونە دەرەوەی سلۆڤیچی کرد.

- دایەگیان منیش حەزم لەوەیە کە تۆ حەزت لێیە.  تۆ نازانی ئەم سەردەمە چۆنە؟ سەردەمی تۆ و باوکم بەدوو سەلك پەتاتە و سەلکی پیازچەندپارچە گۆشت بەختیاربوون.
- ئیستا ئافرەتان جۆرێکی تربیردەکەنەوە بەتایبەتی بۆمن هەرئافرەتیك لێم نزیك دەبێتەوە دەزانم گەرکێتی گازێك لەسەرمایەکەم بگرێت.
- ڕاستە من لەتەمەنی لاویدا هەڵەی زۆرمکردوە و لەکاتی هەژاریدا ژنم نەهانی ئیستا ناتوانم هەڵەی رابووردوم بە هەڵەیەکی تر چارسەربکەم.

دایە پیرە هەستایە سەرپێ بەدەنگی بەرز:

- ئەم قەوانە کۆنە چەند جارگۆیم لێبوە؟ بۆ دواجار پێتدەڵیم جارێکی تر رێگەت نادەم بیتە ئەم ماڵەوە.رۆبلێکی تۆشم ناوێت بە مووچەی خانەنشینە کەمەکەی باوکت دەژیم پاکترە لەپاری تۆ.باوکت تا نەخۆشی نەیدا بەزەویدا لەکار نەکەوت . تۆ نازانی ئێمە چیمان بۆتۆکردوە ؟ پاروی دەمی خۆمانمان بۆتۆ دەرهانیوە. خۆمان سەرمامان دەبوو بەرگی ئەستورمان بۆتۆ دەکرێ.

پەنجەیەکی بۆ وێنەیەکی هاوسەرەکەی درێژکرد.

- بڕوانە ئەوە وێنەی باوکتە ولەتەمەنی گەنجیتیدا چەند جوان بووە. ئەوەش وێنەیەکی تری باوکت لەتەمەنی پریدا .یەك مرۆڤ دوو وێنەی جودا . تۆ خەیاڵخاویت وادەزانی سامانەکەت تا هەتاهەتایە گەنجیتیت پێدەبەخشێ؟

- بڕوانە لاجانی سپیت. بڕوانە ئەو وینەی بەبەرگی قوتابخانەتەوە . ئەوە هەردوکیان وێنەی تۆن .چۆن ئیستا لاجانت سپی بووە . دڵنیابە ڕۆژێك دی ئەژنۆكانت لاواز وتوانای هەنگاونانت نابێ دەبێ پەنا بەریتە بەر گۆجانێك .

- ئیمە تۆمان پەروەردەكرد تابیتە هەورێك بارانی بەختیاری بەسەر زەوی ووشكی پیریماندا بباریني .

- تۆ ئەوەندە خۆویست بویت تەنیا خەمی سامان وپارەو سەرسەریتی بووی .

دایە پیرە بێدەنگ بوو. سلۆڤیچ لاواز لەبەردەم قسەكانی دایكیدا پچوك وچكوتر بووە .دەویست بگری و شەرمی دەكرد بەچاوی تەڕەوە شوفیر وپاسەوانەكانی بیبینن.

دایە پیرە بەدەم نان بڕینەوە بەدەنگیكی هیمن ووتی

- تا ئەوساتەی لەزەماوەندا ئامادە دەبم.

نامەوێت بتبینم

پەنجەی بۆدریژكرد

- تۆدەزانی تەمەنت چەندەیە؟

- تۆدەزانی من چاوەری مردنم؟

- من گەركمە پێش مردنم كورەزاكەم لەباوش بگرم.لەم دونیایدا تەنیا خواو تۆ شك دەبم .

- پێمناڵێت ئەگەر من مردم تۆكێت هەیە؟

- ئا تەنیا تۆ بیرلە سامان دەکەیتەوە لە منداڵیەوە تۆ شەیدای سەرمایە بوویت.

- بەئامانجت گەیشتی.دەوڵەمەندبووی لەڤیلادا دەژیت.

ماشینەکەت بای چەندملوین رۆبڵە کارگەکەت چەندکەس کاریتیدا دەکات.

- بەڵام کەمردی بەتەنیا دەمری کەسێك نیە فرمێسکی خۆشەویستیت بۆ برژێ.

- من پێش تۆ دەمرم.نامەویت بێتە سەر گۆڕم . فرمێسکی درۆم بۆ هەڵبرێژێی .ئەگەر تۆ منت خۆشدەوێت ئاواتەکەم بهێنەدی ؟

بۆ دەرەوە نەدیداری تۆم دەویٚ نەدیاری وفەرموو ئەمەش کێکەکەت.

بەپاڵ سلۆڤیچی کوڕی دەرکردە دەرەوە .

هێندە شەرمەزار و لاوازبوو تەنیا ڕۆحی بەئازارەکانی دەزانی .

تێگەیشت بەرزی مرۆڤ بەسامان ودەسەڵاتەوەنیە. بەخۆشەویستی وکاری باشەیە.

دەر و دراوسی بەچاوێکی گەلەیی و بەزیەوە سەیری سلوڤیچیان دەکرد. نیگاکان هێندە تیژبرپبوون ڕۆحی سلۆڤچیان تا ناخ برپی .

کێکەکەی دایەدەست منداڵێکی کۆڵانە هەژارەکە.

پەسەندی نەکرد.

هەستیکرد ئەو منداڵەش سلۆڤیچ پەسند ناکات .

پاسەوانەکانی کێکەکەیان لێوەرگرت ودەگای ومارسیدیسەکەیان بۆکردەو. بەشەرمەوە کۆڵانە هەژارەکەی بەجێهیشت.

لەبەرچاوی خۆی زۆر پچوك بوو چاوێکی بەناو دراوسیەکانی وکۆلانەکەیان گێڕا. ئەوساتانەی هاتەوە یاد کە دایك و باوکی بێ ئەو توانای نان خواردنیان نەبوو.

ئەوساتانەی دەهاتەوەیاد منداڵێکی عەجول بوو.

هەموو جەستەی ووزەبوو. بیری لەوە نەدەکردەوە.کێی ئەوکەسەیە خۆشە دەوێ.کێیە ئەوکەسەی پیداویستیەکانی ژیانی مسۆگەردەکات؟ لەدایك وباوکی زیاتر؟ چ هەستێکە لەڕۆحی دایك وباوکدا پاروی دەمی خۆیان پێشکەش بەرۆڵەکانیان دەکەن؟

من دەمەوێت ببم بە باوك منداڵەکانم خۆشەویستیم بمژن . منیش بەختیاری.

پەشیمانی بوو بە چەمۆڵەیەك بەدەستی خۆی چەمۆڵەی لە ڕووی خۆی دەنا .

نیگای پڕترسی شۆفیرەکەی لە ئاوینەکەوە بینی.تێگەیشت ئەویش کۆیلەی کارەکەیەتی. دوومنداڵ وژنێك لەماڵەوە چاوەڕیتی.

بۆیە بۆتە ڕۆبۆتەیەکی گۆشتن و هەرچی پێدەڵێم .ئەو دەڵی

- فەرمودەی بەرێزتانە

کەشەپۆلی سەرمایەکی ناکاو سنگی کاتەکانی گوشی ومێشکی لە بیرکردنەوە ئیفلیچ کرد.هەموو ڕەنگە جوانەکانی ژیانی لا تەلخ بوو تەنیا ڕەنگێك بەسەوزی مایەوە ئەویش ڕەنگی سەوزی دۆلار بوو.

سەوز سمبۆڵە ئاماژەیە بۆ سروشت بۆ ژیان بۆ گەشەکردنی کەژەکانی سروشت.ئیستا سامانی باڵەخانەیەك دۆلاری سەوزە .

***کەچی ژیانی ڕەشێکی قەترانی .دەگەڕێ ڕەنگێکی تر هەڵبژێرێ ڕۆحی بڵی ئۆخەی لەم ڕەنگە جوانە .***

***دەیزانی ئەو هەموو خزمەت وماچ و سۆزەی کاتیای سکرتیر بازییەکە و هیچی تر.***

***کاتیا شەیدای سامانەکەی و فەنتازیای ژیانی سەرمایەداری ببوو.***

***چەند جارێ لەکاتی سیکسدا پێدەویت ئاوەکەی تێبکە بۆ ئەوەی سکی پڕببێ وبێکات بەهاوبەشی سامانەکەی.***

***لەنێو ماشینەکەدا بەبێدەنگی دانیشتبوو.***

***بەشوفیرەکەی ووت بۆماڵەوە نەك بۆڕەستوراِن.***

***بەدرێژای ڕێگا بیری لەقسەکانی دایکی دەکردوە.***

***(تۆ هەموو شتیکت هەیە کەچی تەنیایت.)***

***ئاواتە خوازی گەڕانەوەی بۆ تەمەنی گەنجی و هەژاری و سادەی رۆژگارە بەسەرچووەکان بوو.***

***خۆشی نەیدەزانی ژماری ئافرەتەکانی چەندە یە.***

***ڕۆحێکی سەرسەری و ڕەوشتێکی بەرەڵا. ئارەزوویەکی پیس.***

***لەسەربالکۆنی ڤیلاکەوە دەیرِوانیە سەوزی باخچەکەی.***

***جگەرەیەکی چرۆك وپێکی ویسکی بەدەستەوە بوو.***

***مژی لەتالی جگەرەکەی دەدا و تالی ویسکێکەی بەسەردا دەکرد.***

***شیرنی لە هیچیاندا نەبوو.***

***لەچیدا شیرینی هەیە؟***

***لەسامانی زۆر و ژیانێکی ئامێز فەنتازیای نێو ڤیلایەکی تەنیا؟***

یان باوەشێکی خرپنی سێکسی خانمێکی درۆزنی وەك کاتیا ؟
کاتیا هەموو ئەندامێکی جەستەی ئەکتەرێکی کارامەی شانووی ویستە فەنتازیەیەکانی سەرمایەیە بوو؟
دایکم ڕاستدەکات . زۆردەمێکە تەنیام .
تاکەی وابژیم ئاوڕێکی بۆلای قۆڵای ڤیلاکەی دایەوە هەمووشتێکی جوانی تێدایە.تەنیا هەر خۆمم ناشیرنم لێرە .
لەبیرکردنەوە دابوو زەنگی تەلەفونکەلێدا وێڵیکرد.
پاش کەمێك دوبارە زەنگی لێدرایەوە
- هەلەو
- شیرینەکەم یادتدەکەم چاوەڕی تەلەفونت بووم . دایە چۆنە ؟ کەمێکی تر دەگەمە لات
- پیویست ناکات حەزدەکەم ئیمشەو بە تەنیابم . ماندوم
- دڵەکەم دیم مەساجتدەکەم ...تەنیابیت ناخۆشە ئەوەندەم پێ ناچێ .
بەتوڕیە
- پێم ووتی پیویستم بەتەنیایی هەیە تەلەفوونەکەی بەسەر کاتیادا داخست.
مێشکی لەناو گلۆڵەی پرسیارەکاندا جەڕابوو.
تواناى بیرکردنەوەی نەمابوو .
ژماری پێکەکانی فرەبوون .
مەستی بەرچاوی لێڵکرد.

**خەوی لێکەوت**

**خەوی بینی :**

**لە چۆڵەوانێکی تەماویدا تارمای ترسێك خێووێك دوای کەوتووە.**

**دەستەکانی درێژ و نینوکانی تیژ و چاوەکانی تەنیا ڕەنگی ڕەشیان پۆشیووە .**

**تا سلۆڤیچ لە ترسی تارمای خێوەکە ڕایبکردایە دەستی تارمایەکە بۆ قۆرگی دریژتردەبوو . لەترسا کەوتە زەنگاوێکی پڕقەوزەوە.**

**وورده وورده جەستەی بەرە و نقومبوون دەچوو.**

**هاواری دەرکرد و دەنگی دەرنەدەهات.**

**پەلی دەکێشا و چڵە پوشێك نەبوو خۆی پێ ڕزگاربکات.**

**لە پشت تارمایەکەوە خانمێکی پەریپۆش تەنیا دووباڵی سپی وتیشکی چاوەشینەکانی دەبینران .**

**دەستی سلۆڤیچی گرتوو لە زەنگاوەکە ڕزگاریکردوو فڕی بۆ قۆلاّی ئاسمان .**

**سلۆڤیچ لەخەوەکەی ڕاپەڕی . چەشنی کورپەیەکی چەند ڕۆژە بۆ شیری مەمکی دایکی دایە پڕمەی گریانێکی بەکوڵ.**

**هەموو جەستەی لە ئارەق هەڵکشرابوو.**

**چاوانی شینی پەریپۆشەکە لەدیدی ئەودا نامۆ نەبوون .**

**ئەو چاوانەی بینیبوو نەیدەزانی چاوی کێن و لە کۆی بینیونێتی.**

**لەبارێکی دەروونی سەختدا دەژیا.**

**قسەکانی دایکی قورسایەکی دەروونی لەرۆحی دا دروستکردبوو.**

تیشکی چاوە شینەکانی پەریەکەش سەرتای هیوایەکی جوانی پێیبەخشی.

- بۆچی مرۆڤ خەو دەبینی ؟
- خەوچیە ؟
- دوو هێزی دژ بەیەك لەساتیکدا منیان هەڵسوران خێۆێك هەموو ترس و پەریەکی چاوشین مژدەبەخش .
- ئەمەچیە خوایە؟

ئاواتە خوازبوو جەستەی پەرپێۆشەکە بێت ولەم شەوە تەنیایەدا هاوئامێزی بێ.

***هەمان شەوە و ئەننا خەوی لێزراوە و تلی تەنیای دەدا.***

***پرسیارەکان ونەخشەکانی ئاشناکردنی نهێنەیەکان ئاڵۆسکابوون.***

***چۆن ئەلکسەندەرا و باوکی بەیەك ئاشنا بكات .***

***لەنێوان دوو رۆحی پیویست. پردی خەوێك شەوەکەیانی پێکەوە گریدا .***

**هەتاوێکی کز**

شان وملی شەقامەکانی شاری دەشیلا.

لەچاوەڕوانی ناتاشادا لە قاوەخانەیەکدا دانیشتبوو.

یەکێك لە ڕۆژنامە کۆنەکانی دەرهانی و پێش ئەوەی بۆجاری چەند جارە چاوپێکەوتنەکانی سلوڤیچ بخۆینیتەوە لەتەك وێنەکەیدا کەوتەودوان.

خۆشی نەیدەزانی بۆ حەز بە بینی چاوەکانی دەکات.

چاوەکانی پڕن لەبەزی و چاوەڕوانی تکا لەخوا دەکات.

شانسێکی هەبێ بەئاواتی بگات.

کیژێکی جوان تاسە قاوەیەکی خستەبەردەم ئەننا.

بەشێوەیەك چووبوە ناو کۆلانە تەنگەبەرەکانی دێرِی نووسینی ڕۆژنامەکەوە نەئاگای لەقاوەکە بوو لە دونیای قاوەخانەکە .

لەتەك وێنەکەی سلۆڤیچ دا لە دووانێکی دەروونیدا دەژیا.

- من دەزانم تۆ چاوەڕێ چیت .
- من دەتوانم زۆر لەو ئازارەی تۆ بەرۆح و جەستەی منت گەیاند.

لەم تەمەنەدا داتەپینم . ئەوی ڕێگرە لەبەردەم شەپۆلی تورەبوونەکەمدا ویژدان و خۆشەویستی کچەکەمانە . ئەلکسەندەرا تۆی نەبینوە تۆی خۆشدەوێت . منیش ئەلکسەندەرا. ئەو

پیویستی بەتۆیە وەك باوك .من وەك دایك پیویستم پیەتی وەك كچم .جەرگم .

- بۆیە ژیانی خۆم پیشكەش ئەو كرد.ئەو چاوەڕێتە.جەرگی من و تۆیە .

وەك ژنێكی سەلارو هوشیار بە سەر مێردەكەیدا بقژینی بۆ ئەم تاوانەت كرد. قیژەی دەرونی كپی دەستیكرد بە مستەكۆڵە و بەتوندی دایی بە مێزەكەدا وكوپە قاوەكە ڕژا.

بەهۆشخۆیهاتەوە تەریقیەك سەرپۆشێكی شەرم بوو دای بەڕووی خوێدا تا دانیشتوانی قاوەخانەكە نەیبینن.

لەناكاو ناتاشا سڵاوی لێكرد وهەستی بەشەرمەكەی كرد.

بینی كچۆڵەیەك مێزەكەی لەقاوە ڕژاوەكە پاكدەكاتەوە .

دەستی خستە دەستیەوە ووتی

- ناتاشا باش بوو هاتی
- ببورە كەمێك دوا كەوتم
- گرنگ هاتی و منت لەم تەنیایدا وێڵنەكرد
- واز لەمانە بهێنە . ئیستا چیدەكەیت ؟ هەموو میدیاكانی شار باسی سلوڤیچ دەكەن ئەو باوكی كچەكەتە. چ بڕیارێك چ نەخشەیەكت هەیە؟من لەوەتەی تۆم ناسیوە لە هەموو نەخشەیەكدا تۆ براروەیت لەمایندا چۆنی؟
- تۆ دەزانی من چەند كچەكەم خۆشدەوێت. ئاساییە ئەو ئیستا تەمەنی باڵادەبێت ڕۆحی لە دوی باوكی وێڵە .

- زۆرجار پرسیارەکانیم بەبێ دەنگی وەڵامداوەتەوە .
- ناتوانم ئەو پرسیارانە هەمیشە بە بێدەنگی وەڵام بدەمەوە. سلۆڤیچ هەر سزا و ئازارێك بكێشێ بەشێکی رۆحی ئەلكسەندەرا دەیمژێ. هەرچەند تورەم . لێ نەبڕوام بە تۆڵە هەیە نە قوربانی بوونی كچەكەم.
- منیش دەڵێم تۆڵە كارێكی چاك نیەچونكە قوربانی یەكەم جەرگەكەتە.
- ئەوش بیر منە .
- كەسلوڤیچ م لەتەلەفزینەكدا بینی ئەو ساتەم هاتەوە یاد. بەدوو كەتە پیاو سۆارم ببوون . هەر ئەوەندەی لەپشت دەرگاكەوە بەسەرپیاوەكاندا قیژانی( وازی لێبهینن) ئیتر پیاوەكان لەبەر مندا بوون بە كیسەڵ و ژوورەكەیان جێهێشت.
- تائیستا نازانم بۆ ئەو بەزییەی بەمندا هاتەوە؟
- ئەوساتەی تۆ دەتقیژان ئەوخەرێكی لستنەوەی پشت و بۆنی قژی سەری من بوو. قیژەی تۆ رۆحی ئەوی لەبۆنی جەستەی من تۆران.
- تۆ بڵی شەیدای تۆ نە بوویێت ؟
- نازانم ئەوندە دەزانم ژەمی دووهەمی سێكسی زۆر ئارام و لەسەرخۆ و تا ئەوسنورەی كەمێكی مابوو منیش رەحت ببم.
- ئەننا كە سلۆڤیچ م بینی قسە جوانەكان وهەڵویستە بەرزەكەی تۆم هاتەوە یاد. كە لە چاوەڕوانی سك پڕبووندابویت .

- ووت(من كۆرپەی خۆم لەبەر هەڵەی باوکی ناكوژم) من ئیستا زۆر پەشیمانم واتەمەنم نزیك 40ساڵ بۆتەوە کۆرپەیەکم نیە(چاوەکانی ئاوی تێزا)کاشکێ سەرسەریەك سکی پڕبکردمایەو منیش کۆرپەیەکی وەکی ئەلکسەندەرام هەبوایە.
- زۆر گەوج بووم وامدەزانی بەگەنجیتی وشۆخی دەمێنمەوە . وامدەزانی بۆ هەتاهەتایە مەمکم قنچ و باڵام باریك ومۆکانی سەرم ڕەش و چاوم گەش دەبن . بازاڕی سێکسم هەمیشە گەرمە. من گەوج بووم .

وەك دڵنەوایی بکات . دەستی خستە سەر دەستی

- ناتاشا تۆ ئەوەند پیر نیت تا تەنیا چاوەکانت ڕەش ببینن.
- کاتت زۆر ماوە
- دوای 40 ساڵی
- ناتاشا بۆ دەستپیکردنی . شتە نۆیکان هیچ کاتی درنگ نیە
- لێ هەڵەیەك هەیە مەیکە
- چیە؟
- بەووشەی ودیاری پیاوە گەنجەکان بڕوا مەکە . ئەوان کاتیان زۆرە بۆیە بێشەرمن لەبازیکردن بە ئافرەتی قەیرەوە .
- واز لە من بهێنە .تۆ بڕیاری چیت داوە ؟
- تائیستا نازانم ..ئاگادارت دەکەمەوە

- ئەننا تۆ تاقە کەسێکی لەم جیهانەدا کەس نیەجێگەی خۆشەویستی تۆ لەڕۆحی مندا چۆڵ بکات . با ڕستەیەکی ڕوسی جوان هەیە پێت بڵێم .
- ئادەی ...چییە
- ئیرەیەکی جوان بە هوشیاریت دەبەم .

باوەشیان بەیکدا کردوو .

- ئاگاداری هەموو نەخشەیەکت دەکەمەوە.
- دڵنیام سەرکەوتوو دەبێت .

**هەفتەیەك**

**بەسەر بیرکردنە و ژوانی ناتاشای هاورێدا تێپەڕی بوو.**

**ڕۆژێك تەوژمی بیرێك نەخشەیەکی بۆ دارشت .**

**ئا باشترین نەخەشەیە .**

**هەوڵدەدەم .جێبەجی بکەم .**

**دەستی جلی کۆن وناوچەوانی بەپەڕۆیەکی سادەبەست وچاویلکەیەکی کۆنی پزیشکی پیرژنانەی لەچاوکرد.**

**ڕووی بێمیکاچ وباڵتۆیەکی کۆنی بەسەرجلەکاندا لەبەرکرد.**

**لەبەر ئاوینەی گەرماوەکە وەك پیرەژنێکی دیهاتی و نەخویندەوار و داماو خۆی گۆڕی .**

**چوو بۆ کارگەکەی سلۆڤیچ خۆی گەیاندە لێپسراوی کارگەرانی کارگەکە بەزمانێکی پاڕانەوە و تکایکرد یارمەتی بدەن کارێکی بۆپەیدا بکەن. بێکسە و لەشارێکی دورەوە هاتووە بۆکار منداڵێکی بێ باوکی هەیە پیویستی بەیارمەتیە .**

**دیمەنی ئەننا هێندە پیرانە و هەژرانە دەینواند لێپسراوی کارگەرانی کارگەکە دڵی پیسوتاو کاری پاکردنەوەی تەوالێت و هولْ و ژوورەکانی پێسپیرا .**

**بوو بە خانمێکی پاککەرەوە لە کارگە گەورکەی سلۆڤیچدا.**

لەکارەکانیدا زۆرکارامە و پاککار و لە پەیوەندیدا زۆرمیهرەبان.

لەدوورەوە بەنهینی چاودێری سلوڤیچی باوکی ئەلکسەندەرای کچی دەکرد.

ماوەیەك بەسەرکردنەوەی باخچەی مندالاندا تێپەڕی بوو.

هەواڵێك لە کارگەکەدا بلاوبووە ساڵی داهاتوو. سلۆڤیچ پرۆژەی کردنەوەی باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی بۆمرۆڤە پیرە بێکەسەکانی شار دەخاتە بەرنامەی ساڵی داهاتووی .

ئەم هەواڵە ئەننای زۆر دڵخۆشدەکرد.

کارەکانی ئەننا هێندە جوان بوو سەرکاری کارگە ئەرکی پاککردنەوەی تەوالیت و بیرۆی سلوڤیچی پێسپارت. ئەمەش شانسێکی باش بوو تا لەنزیکترین سنورەوە چاودێری بکات.

بەیانیە و ڕۆژ باوەشێکی ڕووناکی کردوە بەبالای شاردا .

سلۆڤیچ چووە بیرۆکەیەوە پاکی و ڕێکوپێکی بیرۆکە و ڕێکخستنی گوڵەکان و ڕوونی شووشەی پەنجەرەکانی بینی . بانگی سەرکاری کارگەگەکرد.

- ئەو کەسەی ئۆڤیسەکەمی پاککردۆتەوە . کێە.؟

- قوربان پیرەژنێکی دیهاتیە .

- زۆرباشە

- با تەنیا ئەو بیرۆکەی من پاکبکاتەوە .

سەرکارکە سوپاسی ئەننای کردوو پێڕاگەیاند

- سەرۆك بەکارەکەی تۆ زۆر ڕەزامەندە.

بەم هۆیەوە ئازادی تەواوی هەبوو چەند کاتی پیویست بێ لە ئۆفیسەکەی سلۆڤیچ باوکی ئەلکسەندەرای کچی بمێنیتەوە کەس سەرنجی نەدا.

کاتیا سکرتێرەکەی سلۆڤیچ خانمێکی شۆخی ساختچی و نازفرۆش وتاکتیکچی بوو.

ئەننا هەستیکرد بازییەکی ناشیرین لەتەك سلۆڤیچ دا دەکات

سەری داخست و لە ژێر چاویلکەکەیەوە ڕۆانیە دیمەنی کاتیا خۆێندنەوەیەکی زانستیانەی دەروونی بۆ کرد .

ئەم ئافرەتە سەرتاپای درۆیە.ئەرکێکی تری بۆ زیاد بوو سلۆڤیچ لەم ئافرەتە بپارێزێ چونکە باوکی ئەلکسەندەرای جەرگێتی .

چووە تەولێتەکە چاوەڕی کاتی ڕۆیشتنی سلۆڤیچ و کاتیا دەکرد.

پاش ماوەیەك سلۆڤیچ ژوورەکەی بەجێهێشت کاتیا دوای کەوت.

بە تەنیا چووە ژوورەکەی سلۆڤیچ ڕوانیە ژوورەکە وەك پێویست زۆرجوان بیرۆکەی پاککردەوە. لەسەرمێزەکەی نووسراویك نووسرابوو.

بۆ وەرزی هاوین وڕیکلامەی جلوبەرگی هاوینە پێویستمان بە چەند ئافرەتێکی تەمەن 17 تا 23 ساڵ هەیە.

تکایە کار لەسەر ئەمە بکەن.

نامەکەی خۆیندەوە لەهەمان ساتدا بوو بە یەك وەڵام

- چۆن بتوانم: ئەلکسەندەرا بگەینمە گۆڕەپانی ئەم کێبەرکێیە؟

لەخۆشیدا پەنجەکانی دەستی لەیەك ئاڵان وچاوەکانی نوقاندوو لە تاریکی چاوەکانیدا نەخشەیەکی کێشا و بڕیاریدا تەنیا خۆی خاوەنی نەخشەکە و پێادەکردنی بێت.

سەرێکی بۆ قوڵای ئاسمان بەرزکردەوە وەك لەتەك خوادا گفتوگۆبکات ,

ـ سوپاس خۆایە .

دەنگی خواش لەئاسمانەوە ووتی

- کچم زۆر دەمێکە بە پاکیت ئاشنام دەستم بە باڵتەوەیە

ئەو ڕۆژە جوانترین لەڕۆژانی ئۆڤیسەکەی سلۆڤیچ و ژوورەکەی کاتیای پاککردەوە .

بابوشکە و ئەلکسەندەرا دوای نان خواردن و کەمێك سەیرکردنی تەلەفزوین هەریەکە لەژووری خۆی نووستن .

ئەننا چووە ژوورەکەی ئەلکسەندەرا و بەئەسپای ئەلبومی وێنەکانی ئەلکسەندەرای دەرهانی.

جوانترین و مۆدیرترین وێنەی ئەلکسەندەرای لێکردەوە .

بۆ ڕۆژی داهاتوو لەکاتی پاککردنەوەی بیرۆکەدا.

وێنەیەکی ئەلکسەندەرای لەسەر مێزەکەی سلۆڤیچ دانا.

بەیانیە و کارمەندانی کارگەکە سەرگەرمی کارن.

بە تێپەربوون سلۆڤیچ سڵاو و ڕێزی لەتەك کارمەنداندا گۆڕیەوە.

کە چووە سەرمێزەکەی یەکەم نیگای وێنەی کێژێکی شۆخی بینی .جوانیەکەی سەرنجی ڕاکیشا.

**چاوەکانی ئەلکسەندەرای کچ و سلۆڤیچی باوك دەکەونە گفتوگۆ.**

- **تۆ کێیت ؟**

- **چۆن هاتویتە ئەم ژوورەی منەوە ؟**

**ئەلکسەندەرا بە سلۆڤیچ دەڵی:**

- **ببورە خۆشم نازانم چۆن گەیشتومەتە ئێرە.**

- **من ئەودالَی کەسێکم نازانم کەی بە دیداری شاد دەبم.**

**سلۆڤیچ بانگی کاتیای سکرتیری کرد .**

**وێنەکەی ئەلکسەندەرای بە دەستەوە بوو**

- **ڕیکلامەی وەرزی هاوینە بڵاوکراوەتەوە؟**

- **نەخێر هیشتا زووە**

- **ئەی ئەم وێنە هی کێیە ؟چۆن گەیشتۆتە سەر مێزەکەی من؟**

**کاتیا وێنەکە وەرگرت تیڕوانی و زۆر جوانە بە تورەیەوە دەڵێت**

- **من ئاگام لەمە نیە**

**وێنەکەی دراند خستیە سەبەتەی کاغەزە بێکەڵکەکانەوە کۆتای بە گفتۆگۆکان هات.**

**کاتی کاردیتە کۆتای وکارخانەکە چۆڵە و تەنیا ئەننا لە ئۆڤیسەکەیە.**

**لەنێو سەبەتەی کاغەزەکاندا پارچەی وینەکانی ئەلکسەندەرای کچی کۆکردەوە.**

**وێنەیەکی نۆی ئەلکسەندەرای خستە سەر مێزەکە و ئۆڤیسەکەی بە پاکی بەجێهێشت .**

بەیانیەیەکی نۆی و دووبارە سلۆڤیچ لەسەر مێزەکەی وێنەیەکی هەمان کیژی ڕۆژی ڕابووردوو بینی . لە رۆحەوە تێڕوانی

چاوەکانی فراوان بوو.

زەردەخەنە ناسکەکانی سەرلیووی ئەلکسەندەرا ئارامییەکی بە رۆحی بێ ئارامی سلۆڤیچ دەگەینی .

ئەمە چ جادوویەکە لەسەر لیو و لە پرشنگی چاوەکانتەوە دەتکیتە ڕۆحمەو ئارامم دەکات.؟

تۆ کێت . لە کوێت؟

کەمێك شەیدا وێنەکە دەبێ .

بانگی کاتیای سکرتیردەکات .

- ئەمە هەمان وێنەی کیژەکەی دوێنیە ؟ چۆن ؟ کێ هانیوتیە ئێرە ؟

کاتیا کە وینەکە دەبینی تورە دەبێت دەڵێت

- دوێنی پێمووتی کاتی ڕیکلامە نەگەیشتۆتە کاری جێبەجیکردن منیش نازانم ئەم وێنەیە هی کێیە وینەکە دەڕینی و دەیخاتە سەبەتەی کاغەزەکانەوە.

دەستدەکاتە ملی سلوڤیچ وبەبۆنی عەتری سیکسی لەبیرکردنەوە دوری دەخاتەوە .

دەزانی کاتیا چۆن بازی بە باوکی ئەلکسەندەرا دەکات

وێنەدڕاوەکانی ئەلکسەندەرای کچی کۆدەکاتەوە دەیخاتە جانتاکەیەوە.دوای پاککردنەوەی ئۆڤیسەکە وینەیەکی تر دەخاتە سەر مێزەکەو کارگەکەجێدەهێڵێ.

***کاتیا و سلۆڤیچ هەردووکیان جەستەیان ڕووتە.***

***لەسەرپێخەفێکی پەشمەکی لەیك ئالاون.***

***کاتیا سەرتاپای جەستەی لەبۆنی سیکسی هەڵکێشاوە.***

***چەند مۆمێکی کز ڕووناکی .***

***مۆسیقایەکی بێ نۆتەیە و بێدەنگی بە ڕۆحی ژووری نووستنەکەی سلۆڤیچ بەخشیوە .***

***سلۆڤیچ ناوگەڵی بلاوکردۆتەوە کاتیا تا قولای دەمی بۆاربدا بۆی دەمژێ . وەك پارچەیەك گۆشتی ساردەبوو گەرمای دەمی کاتیا ناوگەڵی سلۆڤیچ ئەستورناکات.***

***کاتیا بۆی دەمژی و سلۆڤیچ لەغەمدایە.***

***ملچەملچی مژینی کاتیا تێکەلاوی قسەکانی دایکی دەبێت***

***- تاکەی ئەم سەرسەریە بۆ بیریك لە ئایندە ناکەیتەوە ؟***

***سەریك بەرزدەکاتەوە دەڕوانیتە گۆپکەکانی مەمکی کاتیا .***

***جەستەی جوانی.چاوە پڕ پاشقولەکانی .***

***ئارەزووی سیکسی سلۆڤیچ دەبێت بە بەستەڵەکێکی زستانی روسیا.***

***پرچە زەردەکەی کاتیادەگرێت وسەری لە نێوگەڵی دوور دەخاتەوە لەدەمی دەردەهێنیت و دەچێتە ژێردۆشەکە و دووشێکی گەرم دەکات.چاوەکانی دەنووقینی چاوی وێنەکان دێتە سەرپەردەی ڕەشی چاوەکانی و دڵشادی دەکات بۆ ئەو وێنانە بەختیاری بە ڕۆحم دەگەینێ؟***

زیاتر چاوی دەنوقینی تاچاوی وێنەکانی سەرمێزەکە لە سەر شانوی تاریکی چاوی ون نەبیت. کاتیا لەناکاو باوەش بەجەستەی سلۆڤیچ دا دەکات و وێنەی چاوەکان لەبەرچاوی دەشڵەقینی سلۆڤیچ بەتورەیەوە پاڵێك بە کاتیاوە دەنێت .

پشت لە کاتیا دەکات و لەباوەشی پێخەفێکی درکەزیدا دەنوێ.

بۆ بەیانی کەدەگەنە بیرۆکە کاتیا پێش سلۆڤیچ دەچێتە سەر مێزەکەو وێنەکی نۆی هەمان ئافرەت دەبێنیت.

سلۆڤیچ لەدەستی وەردەگرێت.دەستێك بەنیو قژە ماش و برنجیەکانیدا دەهێنی و بە کاتیا دەڵێت سەرکارکەکم بۆ بانگ بکە.

سەرکار لەبەردەم سلۆڤیچ و کاتیادا وەستاوە چاوەڕی پرسیارو وەڵامە سلۆڤیچ دەروونێکی ئارامی ئاڵۆسکا و پرسیارێکی نادیار.

لەرۆحدا زۆر لاواز لە پێگەی کاردا وەك خاوەن کارگە خاوەنی گشت بڕیارێکە.

بەدەروونێکی مەنگەوە بەدەنگیکی پڕ پرسیارەوە ڕوودوکاتە سەرکار و دەڵێ :

- کێ ئەم ئۆڤیسە پاکدەکاتەوە؟

- قوربان خانمێکی پیری لادی داماوە

- خوێندەورای هەیە؟ قوربان بڕواناکەم

- کێ تر دێتە ئەم بیرۆیە ؟

- کەسێك نیە لە بەرێزتان و کاتیا خانم زیاتر

ئاوڕیك لە كاتیا دەداتەوە ترسێك یەخەی چاوی دەگرێت و ڕووی پرسیارە زبرەكان دەخەتا پێلانێكی پیسی كاتیاوە.

كۆتای بەپرسیارەكان دێنی وێنەكە لەكاتیا وەردەگرێت و پارچەپارچەی دەكات و دەیخاتە سەبەتەی كاغەزەكان و كاری ئاسای دەستپێدەكەن.

كۆتای كاتی كارە .

ئۆڤیسەكە چۆڵە تەنیا ئەننا بەسەتڵی ئاو شامپۆ و گەسك وبابەتی پاككردنەوە بەوێیە.

لە سەبەتەی كاغەزەكاندا پارچەی وینەكانی ئەلكسەندەرا هەڵدەگریت.

وەك هەمیشە كاری خۆی بەجوانی دەكات. وێنەیەكی نۆی ئەلكسەندەرا دەخاتە سەر مێزەكە.

ئەلكسەندەرا لەو وێنەدا هەردوو دەستی والآكردۆتەوە چاوەڕیی باوەشێكە.

سلۆڤیچ وەك بڕوای وابێت ئەم بازی وینانە نەخشەی كاتیایە.

بۆ ڕۆژی داهاتوو كە وێنەی ئەلكسەندەرا دەبینی. بە تۆڕەیەوە پارچەپارچەی دەكات وفرێدەداتە نێو زبڵەكانەوە. لە هەمان كاتدا پەشیمان دەبێتەوە ئاوڕێك بۆ پارچە دڕاوەكانی نێو سەبەتەی زبڵەكە دەداتەوە . پارچەی وینەیك هەڵدەگرێ نیوەی چاویكی ئەلكسەندەرا .

دەلێ :

= تاوانتكرد وینەكەمت دراند.

وێنەی ڕۆژی داهاتوو ئەکسەندەرا هەردوو دەستی تێکەڵاوکردووە کردویتی بەپشتیەکی نەرم و ڕوومەتێکی لەسەرخەواندووە چاوەکانی لەگلێنەی کامیراکەچەقاندووە هەر بینەرێك ئەم وێنەی ببینی تێدەکات خاوەنی ئەم وێنەیە چاوەڕێ دێداری کەسێکی خۆشەویستیە کەسێك کە لەژیاندا نەی بینیوە.

کەسێك پیویستی بە گۆڕینەوەی خۆشەویستی هەیە.

کەسێك نایەویت بەتەنیای بژیت وپرسیارێکی بێ وەڵامی هەبێ.

کێژیك زۆر دەمێکە پرسیارێکی لا ورژاوە وێڵی وەڵامە.

کەسێك دەیەوێت خۆی بەختیاربێت وبەختاری بەکەسێکی غەمبار ببەخشێ.

کەسێك زۆر تەنهای رۆحەو تەنیا رۆحێك چاوەڕێ رۆحیتی .

سلۆڤیچ وێنەکە لەچاوەکانی نزیك دەکاتەوە .

چاوەکانت پڕن لەپاکی و چاوەڕوانی .

من دەزانم تۆ دەبێتە فاکتی بازیەك تەنیا ڕۆژگار ئەنجامی دەزانی هیوادارم تۆ بازی دەستی کاتیا نەبێت.

کە پیاو پیربوو دەبێتە بازی خانمانی گەنج .

من ڕیگەنادەم کاتیا بە جوانی وێنەکانت بازی بە من بکات ڕەنگە تۆش قوربانی نەخشەی کاتیا بیت ؟

لەوێنەکەی دەڕوانی ولەدڵەوە حەزەی بەبینین دەکا ئەمجارە وێنەکەی نەدڕاند و لە نێو مستیدا بەنابەدڵیەوە چرچیکردوو فڕیدایە سەبەتەی کاغەزەکانەوە.

***لەكاتی كاركرتندا چاوی وێنەكان لەسەر كاغەزە سپیكەی بەردەستی بۆ ساتێكی كەم پڕچەیانكردەو دیارنەمان.***

***سلۆڤیچ ئاوڕی لەسەبەتی كاغەزە بێكەڵكەكان دایەوە وێنەكەی ئەلكسەندەرای لەسەبەتەكە دەرهانی و چرچركانی ڕێكخست دەستی تكای بە ڕووی وێنەكدا هانی و تێر ڕوانیە چاوەكانی.***

***من نازانم بۆ حەز بە بینی ئەم چاوانە دەكەم ؟***

***لەڕووی ئەم وێنەیەدا دوو شێوەی تێدا دەبینم.***

***شێویەك لەتیشكە شینەكانی چاوی دایكم و بەشێكی تری ڕەنگ ودیكۆری ڕووی خانمێكە بەمیژووی مندا گوزەریكردوە بۆیە بە رۆحی من ئاشنانن نازانم كەی من ئەو ڕەنگە ڕۆحیانەم بینوە؟***

***لێوەكانی حەزێكی كۆنم دینەویاد . كەی لەم شێوە لێوانە بە حەزی من ئاشنابوون؟ ئا ڕەنگی چاوەكان دیكۆری ڕوو و پیكهاتەكانی ئەو وینەیە ڕەنگیان لە میژووی مندا هەیە.***

***وێنەكەی لا خۆشەویستەبێت وەك پەشیمانی لە چرچكردنی بكاتەوە بەئاستەم وسۆزەوە دەست بەڕووی چرچی وێنەكەدا دینی .***

***لەدڵەوە داوای لێبوردنی لێدەكات.***

***لە كارەكەی دەوستیت وبیركردنەوەیەك گێژی دەكات.***

***وێنەكە بەدەمدا لەسەر مێزكە دادەنێت .***

***ئۆڤیسەكە چۆڵە ئەننا كەوێنەكەی ئەلكسەندرا بە پشتا و بەچرچۆلۆچی لەسەر مێزەكە دەبینی هەستدەكات ئەمبازی وینانە ئاشنایەتی و خۆشەویستیەكی سەرەتای لەنێوان سلۆڤیچ و وینەكانی***

ئەلکسەندەرای کچیدا دروستکردوە . نەدڕاندی وینەکەش مانی پەشیمانییە لە دڕاندنی وینەکانی پیشوی.

وێنەیەکی تری خستەسەر مێزەکەی و وینە چرچکراوەکی لەگەڵ خۆیدا برد.

گەڕایەوە ماڵەوە .

بابوشکە وئەلکسەندەرا نووستبوون .

وینەدڕاوەکانی ئەلکسەندەرای بە تیپ پێکەوە چەسپکرد و خستینە زەرفێکەوە.

کاتی ڕکلامەکردن نزیك بووە.

ڕۆژیك پێش دەستپیکردنی کاتی پاککردنەوەی .

ئەننا بەئەلکسەندرای کچی ووت .

- سبەینی ژووانێکی زۆرگرنگمان هەیە تاقیکردنەوەیەکی چارەنووسدارە.دەچین بۆ بازاڕ دەمەویت بەدڵی خۆت جوانترین بەرگ بکریت سبەینی تۆ جوانترین کیژی ئەم شارە بیت.

ئەلکسەندەرا پێکەنی ووتی :

- دایکە دەمدەی بەشوو
- نا کچم شوکردنی تۆ و هەڵبژاردنی هاوسەر ئەرکی من نیە.
- تۆ هیشتا گەنجی وکۆمەڵی ئەرکی ترت لەپیشە پیشتر لە شوکردن.
- ئەی چی بێ ئەو ژوانە گرنگەی گەرکتە من ببم بە جوانترین کیژ ئەم شار؟

- وەڵامی هەموو پرسیارێك لە كاتی خۆیدا پیویستە.درنگ یان زوو لە وەڵامدا هەڵەیە, چاوەڕێ بكە.

ئەلكسەندەرا هێندە بڕوای بەهوشیاری دایكی هەبوو بێ بیركردنەوە گشت بڕیارێكی دایكی جێبەجی دەكرد.

بۆ ڕۆژی داهاتوو ئەلكسەندەرا ودایكی بەجوانترین شێوە خۆیان گۆڕی ئەننا خانمێكی قەیرەی ناسك ڕۆح گەیوو . ئەلكسەندەرا كیژیكی تەمن خونچە وشۆخێكی ڕەسەنی ڕووسی .

بەتەكسییەك گەیشتنە بەرقاپی ساختومانێكی گەورە لێ نوسرابوو كارگەی بەرگی سلۆڤیچ .

لەتەكسیەكە دابەزین .

چەند هەنگاوێكیان مابوو بگەنە دەرگای سەرەكی ساختومانەكە .

ئەننا لەجانتاكەی پاڵتۆیەكی كۆنی دەرهانی و لەژێر سیبەری درختێكدا . بەسەر بەرگە جوانەكانیدا لەبریكرد. بە پەڕۆیەكی سادە ناوچەوانی بەست و چاویلكەیەكی ئەستوری كردە چاوی .

ئەم دیمەنە ئەلكسەندەرای توشی شۆكێكی بێدەنگی كرد.

هیچ پرسیارێكی نەكرد. بەنیگایەكی چاوەكانی دایكی تینویتی پرسیارەكانی شكاو چۆنكە دەیزانی هەموو ووشەیەكی زاری دایكی بێ بیركردنەوە نیە هەنگاوەكانی بێ نەخشە نیە.

لەچاوەڕوانی نمایشكی چاوەڕواندا بوو.

گشت كارمەندانی كارخانەكە سەرگەرمی كارن.

***بەدرێژای هۆڵی کارگە ژوورکان دیواری پەنجەریان هەبوو هەر کەسێك بەپیرەوکەدا تێبپەڕببوایە هەموو کارمەندان دەیان بینی.***

***ئەننا بەبەرگی هەژاری و وەك کریکارێکی پاکەرەوە ناسراوبوو جێ سەرنجی نەبوو.ئەوەی جێ سەرنج بوو شۆخی ئەلکسەندەرا و لەتەك ئەودا.***

***کارمەندان لەجوانی شۆخی ئەلکسەندەرا و لەتەك خانمی پاککەرەوە سەرسام بوون.***

***چوونە قاتی سەرەوە بۆ ئۆفیسەکەی سلۆڤیچ***

***بەردەم مێزەکەی کاتیادا وەستان .***

***ووتی :***

***- سلۆڤیچ میوانی نیە.***

***- کاتیا بێئەوەی سەری هەڵبڕێ و نرخی بۆ دانەنا.***

***خەرێکی نینوکانی بوو .***

***- بڕۆ زوو هاتوویت ئیستا کاتی پاککردنەوە نیە .***

***ئەننا پرسیارەکەی بە تۆنێکی تر دووبارەکردەوە***

***کاتیا سەری هەڵبڕی و ئەلکسەندەرای لەتەکدا بینی وڕماو هەستایە سەرپێ وێنەکانی هاتەوە یاد***

***سەیرێکی ئەننایکرد . ووشە لەسەر زمانی پڕما .***

***ئەننا گۆی بەکاتیا نەدا ودەستی ئەلکسەندەرای گرت و چوونە ژورەکەی سلۆڤیچەوە.***

سلۆڤیچ بە تەلەفون قسەی دەکرد . پشتی کربووە دەرگاکە و ڕووی لەپەنجەرکەکردبوو .

لە بەردەم مێزەکەدا وەستان .

کاتیا بە تورەی و دەنگی بەرزەوە ویستی ئەننا وئەلکسەندەرا دەربکات . دەنگە دەنگ لەنێوانیاندا دروستبوو .

سلوڤیچ لەدەنگی کاتیا ڕاچڵەکی و ئاوڕی دایەوە

ئەننا وئەلکسەندەرای بینی .

وێنەکانی هاتەوە یاد.

تەلەفونەکەی داخست و بەسەرسامیەوە هەستایەی سەرپێ و ڕوانیە ئەلکسەندەرا و ئەننا

ئەلکسەندەرا حەپەسابوو چاوەکانی لەنێوان سلۆڤیچ و دایکیدا دەگێرا ئاگای لەنهینی نەخشەکە نەبوو.

ئەلکسەندرا سلوڤیچی ناسیەوە ئەو پیاوەی ماوەیەکی زۆر گشت میدیاکانی شار لەسەریان دەنوسی .

وەك کەسێکی بێ زمان وجەستەیەکی بێ ووزە تەنیا چاوەکانی لەچاوەکانی ئەلکسەندەرا تواببووە .

چاوەکانی پردی ووشەکانی سەرزاری بوو لەنێوان ئەننا وئەلکسەندەرا دەگۆیزایەوە.

چاوەکانی ئەننا لە ژێر چاویلکە تەلخەکەدا بەباشی نەدبینرا و بەبەرگی کرێکارێکی پاککەرەوە لێ بە هێزێکی ڕوحی و کەسایەتیەکی بەرزەوە لە سلۆڤیچی دەڕوانی .

ئەلکسەندەرا لە جوانترین بەرگێکدا شۆخێکەی شۆختربوو.

هەرسێکیان بێدەنگ بوون و هەرسێکان چاوەڕوان و هەرسێکیان تینوی ڕاستیەکان بوون.

جارێك تر کاتیا بەتوڕەی و بێ ڕێزیەوە پەلاماری باڵێکی ئەننایدا بۆ دەرکردنی .

ئەننا بەهێمنیەوە دەستی کاتیای لەباڵی ترازان چاویلکەکەی داگرت پەڕۆکەی ناوچەوانی فڕیدا و پاڵتۆ هەژارێکەی داکەند و قژی پەرشکرد .

جوانی ڕەسەنی خۆی ئاشکراکرد.

سۆڤیچ و کاتیا کە ئەننایان بەو شێوەیە بینی زمانیان لە گۆ وەستا .

سلۆڤیچی ئەننای ناسیوە .

جەستەی ئەلکسەندەرا ئاگردانێکی پڕ پشکۆی پرسیاربوو.

ئەو پیاوەی شاریك باسی لێوەدەکات . وێنەکانی لای دایکی پاریزراوە .ئیستا ئەم بینەری شانۆیەکە نازانی خەوە یان ڕاستی .

تەنیا چاوەکان دەدوان زمانەکان ویلی چەند ووشەیەکی جوان شایانی ئاشناکردنی ئەو میژوو نهێنیە بێ . تەنیا ئەننا دەتوانی بیدرکێنێ.

ژوانی چاوی کچێکی تینوی بۆ بینی چاوی باوکی و چاوی باوکێکی شەیدا ودیوانەی بۆ بینی چاوی جەرگێك پردێك دروست بوو.

تەنیا دوو ڕۆحی چاوەڕوان دەتوانن پێناسەی بۆ بکەن.

سلۆڤیچ کاتیای لەژوورەکە دەرکرد.

***لەچانتاکەی وێنە دڕاوەکانی ئەلکسەندەرای دەرهانی و بەڕیز یەك لەدوای یەك خستینیە بەردەم سلۆڤیچ .***

***ئەلکسەندەرا هەربێدەنگ وچاوەکانی پڕبوون لەئاو تکە فرمێسکەکان گشتی ووشەی پرسیارەکان ولە ڕێزی دایکیدا نەیدوێرا فرمێسکەکان بهێنیتە دەنگ. بۆیە بەهەر دوو دەستی دەمی گرتبوو.***

***گلێنەی چاوەکانی لەنێوان دایکی و سلۆڤیچ دا دەیگێڕا و نەیدەزانی ئەم شانۆییە بەچ ئامانجێك دەگا.***

***سلۆڤیچ کە ئەنناى بە جوانی بینی ڕۆژی ئەتکردن و تاوانەکەی هاتەوە یاد.***

***سلۆڤیچ لاوازبوو چەشنی چڵەگیاکی قەد لاواز لەبەر ڕەشبای تاوانەکانی میژوویدا لەبەردەم ئەننادا چەمایەوە.***

***بوو بەکۆیلەی هەڵەکانی میژووی هەردوو دەستی خستە سەرمێزەکە تا قورسای خۆی پێڕابگرێ.جومگەکانی هێندە لاوازبوون نەیدەتوانی بەرامبەر ئەو تاوانەی لەئەننای کردووبوو خۆی ڕابگرێت .***

***دایە گریانیگی بەکوڵی بێدەنگی پیاوانە.***

***لەبەردەم ئەو پەیکەرە پاکەی 17ساڵ بێدەنگی دەخواتەوە.***

***ئەلکسەندەرا ووزەی پساو ڕویکردە دایکی و بەزمانێکی پاڕانەوە وئاوازی گریانیکی پڕتکا ووتی:***

***- دایە دڵم تەقی ئەم شانۆیە چ ئامانجێکی لەپشتەوەیە ؟***

***سلۆڤیچ بەووشەی دایە فرمێسکەکانی ڕژانە سەر ڕوی وێنەکانی ئەلکسەندەرای سەرمێزکە . پێش ئەوەی ئەلکسەندەرا بە ئامێزی شاد***

***بکات وێنەکانی لەباوەشگرد لەحیاتی ئەو ماچی وێنەکانی کرد, دەنگی گریانەکەی باڵا بوو.***

***ئەننا هوشیار بوو جڵەوی دوو دەروونی پڕ پرسیاری نامۆی گرت بوو.***

***دەرونی پاکی چاوەڕوانی ئەلکسەندەرا و دەروونی پەشیمانی سلۆڤیچ .***

***بێدەنگێکە تەنیا ئەننا دەیتوانی بیشکێنێ .***

***هەردوو ڕۆحی سلۆڤیچ وئەلکسەندەرا چاوەڕێ بوون .***

***باوەشێکی میهربانی بەئەلکسەندەردا کرد سەری ماچکرد ووتی :***

***- کچە شیرینەکەم . دەزانی من چەند تۆم خۆشدەوێ ؟***

***= زۆر دەمێکە چاوەڕێ وەڵامی پرسیارێکی***

***- کێ باوکتە ؟***

***ئەلکسەندەرا: بە ئارامی وپاڕانەوە ووتی***

***- دایە گیان ئەمە چ پەیوەندیەکی بەپرسیاری باوکی منەوە هەیە ؟***

***ئاماژەی بۆ سلۆڤیچ کرد .***

***- کچم ئەوە باوکی تۆیە .***

***لە چرکە ساتێکی چاوەڕوانکراودا .***

***تەنیا دەنگی بێدەنگی خۆا ..***

***لە ناخی مرۆڤە چاوەڕوانەکاندا دەبیسترا .***

***سلۆڤیچ : بە ووشەی باوکە جومگەکانی ووزەی تێزا چاوەکانی تەڕای هەموو جەستەی مژی باوەشێکی سۆزی باوکایەتی بە ئەلکسەندەرا کرد .***

***چونکه لەژیانی ئەلکسەندەرا پیاوێك نەبووە وەك باوك لە ئامێزی بگرێت , لەئامێزی سۆزی باوکیدا گەرمایەکی نامۆ ڕۆحی ئارامکرد و سەری لەژێر باڵەکانی باوکیدا بۆ ساتیك خەوان .چرکە خەوێکی بینی لەژیانیدا نەیبینی بوو.***

***لەیەکەم گەیشتینی هەردوو جەستەی تینوو بوونی ڕۆحەکان یەکتریان مژی و بۆ یەمکجار دوو مرۆڤ باوك و کچێك رۆحیان تیکەڵاو بوو.***

***ئەلکسەندەرا سەری لەسەرسنگی باوکی لارکردەوە ڕوانیە ئەو مرۆڤە مەزنەی ئەم ڕۆمانە جوانەی بەئەمانیتی مرۆیەوە بەچرکەکانی ژیانی نووسیوە.***

***هەردووکیان بوون بەدوو ووشەی تکا و ڕێز وخۆشەویستی و وەفا و هەموو کەرکتەرە جوانەکانی مرۆڤ***

***سلۆڤیچ وەك گەرەکی بۆ تکا وداوای لێبووردن دەستی ئەلکسەندەرای کچی گرت وچوونە بەردەم باڵای ئەننا.***

***وەك کۆتای چیرۆکەکەی لەنێو دەستەکانیدا حەشاردابوبێت . پەنجەکانی هەردوو دەستی تێکەڵاوکردبوو.***

***سلۆڤیچ لاواز ولەسەر ئەژنۆکانی بۆی نوشتایەوە.***

***وەك لەکەنیسەدا  دەست بۆ پیرۆزی خوا بۆ لێبووردن بەرزبکاتەوە . دەستی لێبوردنی بۆ ئەننا بەرزکردەوە .***

***- تکایە . تکایە بەپاکی ورێزی خۆت وخۆشەویستی ئەلکسەندەرا بمبەخشە . بمبەخشە تکایە...... بمبەخشە.***

ئەلكسەندەرا لەبنینی ئەودیمەندا گریانێکی ناسك جەستەی خستبووە لەرزە و نەیدەزانی ئەو تاوانە چیە وا باوکی داوی لێبوردن لەدایکی دەکات.

وەك پێ بیژی لەبەر خاتری خۆشەویستی تۆ لە هەڵەکانی باوکت دەبوورم.

سەیرێکی ئەلکسەندەرای کرد.

دەستی خستە سەر شانی سلۆڤیچ بەرزیکردەوە.

ووتی:

- من و تۆخاوەنی یەك جەرگین . بەخشیمیت بە خۆشەویستی ئەلكسەندەرا وهیوای میژوویەکی جوان.

سلۆڤیچ لەخۆشیدا هەردوو دەستی ماچکردو . بەسۆز و ڕێزەوە لەئامێزگرت .

هەرسێکیان باوەشیان بەیکداکرد.

کە بەدەنگی بەرز سلۆڤیچ کاتیای لەئۆڤیسەکە دەرکرد.کارمەندانی کارگەکە سەریان سوڕما بۆ یەکمجارە دەنگی تورەی سلۆڤیچ ودەرکردنی سکرتیرەکەی ببیستن .

لەدەرەوی ئۆڤیسەکە گشت کارمەندان لە مقۆمۆقوی نهێنی ئۆڤیسەکەی سلۆڤیچ دابوون.

- دەبێ چ کارەساتێك ڕوویدا بێ ؟

- خانمێکی پیری هەژاری لادیی و کێژێکی جوان ئۆڤیسەکەی سلۆڤیچیان شڵەقاند .

***کارمەندی بەترسەوە بە هاورێکەی ووت .***

***- یەکمجارە دەنگی بەرزی تورەی سلۆڤیچ ببیستم.***

***= ئەمە چیرۆکێکی سەیری لەپشتەوەیە.***

***- ئەو ئافرەتە پیرە لادییە هەمیشە بە بێدەنگی و بە زەردەخەنی سادەی پڕ شەرمەوە دەیڕوانیە من . کە دەیبینی من مکیاچم دەکرد وئەویش تەوالیتەکانی پاك دەکردەوە , شەرمێکی جوان تێدا دەبینرا. ئیستا ئەو لە ئۆڤیسی خاوەنی ئەم کارگەیەوە . کودەتایەکی نهینی کردەوە کەس نازانی ئیستراتجیتی چیە؟ چ هێزیکی هەبێ کەسێکی وەکی سلۆڤیچ کە نێوەی ئەم شارەی هەیە .تورە . وا ماوەیەکە بێدەنگ و لاواز بکات ؟***

***کارمەندی بە هاورێکەی ووت.***

***- با لەمە گەڕین من دەلێ لەسەر پشکۆم . ئەم ئافرەتە لادییە هەژارە و ئەو کێژە پەریپۆشە چۆن بەیەکەوە دین بۆ ئێرە ؟***

***- واز لە جوانی بێنە . بابزانین بێدەنگی سەرۆك چیمان پێدەلی ...کارمەندیکی پیاو ئەمەی ووت***

***- ئێوەی پیاوان زۆر بێ رۆحن... تەنیا چاوەڕێ خواردنی ئامادەی سەر مێزن و بیرناکەنەوە . ئەوە ئێمەین ئافرەتان هیچ هەنگاوێك بێ بیکردنەوە نانین .***

***دەنگی پێلاوە بەرزەکانی ئەلکسەندەرا .***

***وەك موسیقای سوپا چۆن سەربازەکانی بێدەنگ دەکات . ئاوا گشت کارمەندانی بێدەنگ کرد.***

سلۆڤیچ بەچاوی تەڕ و بۆینباخی شل و بێ چاکەت وکراسەکەی لە پشتینەکەی کەمێك ترازابوو , قژەکانی سەری تێکەڵاو . بەزەردەخەنەی شانازیەوە ڕووی پیشانی کارمەندان دا.

دەستی ئەلکسەندەرای کچی و ئەننای گرتبوو .

ئەننا بەبێ پاڵتۆ سەرپۆش وچاویلکە وێنەی خانمێکی قەیرە شۆخ لەتەك ئەلکسەندەرا و سلۆڤیچ هاتنە نێو هۆڵی کارمەندانی کارگەکە.

کارمەندان کۆ و بێدەنگ

- سلۆڤیچ بەدەنگی بەرز ووتی .بەڕێزان ئەمە ڕێکەوتە یان کاری خوا؟ و کاری مرۆڤە مەزنەکانە ( ئاماژەی بە ئەننا کرد)

دەستی ئەلکسەندەرای بەرزکردەوە و سەری ماچکرد و باوەشی پێداکرد

- ئەم کێژە شۆخە دەبینن ؟

کارمەندان وەڵامیان بێدەنگی بوو.

- ووتی

- ئەم شۆخە کێژە ئەلکسەندەرای کچمە .

دەستی ئەننا ماچکرد ووتی :

- ئەم دایکە مەزنە17ساڵەخۆشەیستی بۆئەم ساتەی من کۆدەکاتەوە ئەو ئافرەتەی بۆگەیشتن بەڕاستیەکان ماوەیەکە وەك کرێکاری پاککەرەوەی تەوالێت کار لێردەکات.

- ئەم مرۆڤە مەزنە دایکی جەرگەکەم و هاوسەری ژیانی داهاتوومە .

***دڵخۆشی هێندە باڵابوو گریان لای شەرم نەبوو بۆیە بە دەنگی بەرز هاواریکرد سوپاس ئەنناى مەزن جارێکی تر لە ئامیزگرت.***

***هەموو کارمەندا لە خۆشیدا کەوتنە چەپڵەلێدان.***

***له شوینژینه سادەکەی ئەننادا .***

***بابوشکەو ئەننا وئەلکسەندەرا وسلۆڤیچ له دەوری مێزێکی سادەی و لەچیشتخانەیەکی کۆندا دانیشتبوون .***

***رۆحی بەختەوەری سلۆڤیچ هێندە بەختیاربوو . چاوەکانی کەوتنە بەراوردکردنی چیشتخانەکەی خۆی وئەم چیشتخانە سادەیە وجیاوازی لەنێوان بەختیاری رۆحەکان .***

***ئەننا خەریکی ئامادەکردنی چا و دانانی کێك بوو .***

***بابووشکە بەبێ دەنگی دەیرِوانیە ئامێزە گەرمەکەی سلۆڤیچ و ئەلکسەندەرا .***

***رۆحی ووتی چەند خۆشدەبوو منیش کورەزام هەبوایە و کورەکەم نەبوایە بە قوربانی ئەفغانستان .***

***فرمیسك تەقی لێ رۆحی پاکی بابوشکە تەرِای چاوەکانی قوتدا تا بەختیاری باوك وکچێکی چاوەرِوان و ئەنناى خانم کاڵنەبێتەوە .***

***سلۆڤیچ کووپی چاکەی هەڵگرت.***

***کوپێکی سادە وچایەکی سادە .***

***چیشتخانەیەکی سادە .***

***هەستێکی بەختیاری باڵا له ژیانیدا نەی چەشتوە .***

***لێوی کووپی چاکانی من ئاڵتون رێژە. کەچی نەقاوە نەچاکانی تامی ئەم چایەی نێو ئەم کووپە سادە هەژارە نادا.؟***

چیشتخانکەی من زەوی ومێزی مەڕمەڕ وگرانبەهای ئیتالّی وئەڵمانیە کەچی تامی ئەم دانیشتنە زۆر لەچیشتخانەکەی من بەتامترە.

کەپیتال مرۆڤەکان بەختیار ناکات گەر هوشیاری لەتەکدا نەبێ .

هەموو ڕووەکان تکی زەردەخەنەی لێدەتکا تەنیا بابوشکە نەبێ .غەمی لەدەستدانی ئەننا و ئەلکسەندەرای هەبوو.

ئەننای هوشیار دەیزانی . بابوشکە غەم وفرمێسك دەخواتەوە. باوەشی پێداکردبوو . تا هەست بەتەنیا و ترسی ئایندەی نەکات .

سلۆڤیچ ویستی هاوبەشی بەخشکردنی خۆشەویستی بێ بۆ رۆحی بابوشکە دەستی خستە سەر شانی بابوشکە ووتی :

- ئەلکسەندەرا دەزانی تۆ دوو بابوشکەت هەیە ؟
- بابوشکەیەکی ترتت دایکی منە ؟

لەچاوەڕی مردندایە لێ هیوایەکی هەیە کەکەسێك پێبلّی بابوشکە . هەموو ڕاجلّەکین.

بابرِوین تۆ بکەم بەدیاری رۆژگارەکانی داهاتووی دایکم تا بێ هیوا ماڵئاوی لەژیان نەکات .

ئەننا و ئەلکسەندرا و سلۆڤیچ چوون بۆ لای دایکی.

چەپکی گولّ و کێکێکی جوانیان کڕی.

هەرکاتێك مارسیدسە رەشەگران بەهاکەی سلۆڤیچ دەگەیشتە گەڕەکی هەژاران.دانیشتوانی گەڕەك چاوەڕی دەماقلّییەی سلۆڤیچ و دایکیان دەکرد.

ئەمجارەیان سلۆڤیچ تەنیا نەبوو خانمێکی قەیرەی شۆخژن و کێژێکی جوان لە مارسدسەکە دابەزین چاوی پەنجەرەی کۆڵانە هەژراکان بزەی هەواڵێکی خۆشی بە خانووە کۆن وماندووەکان دەدا.

سلوڤیچ لەدەرگای شۆنژینەکەی دایکی نەدا.

کیژێکی شۆخی باڵا بەرزی نازدار بەبەرگێکی ڕازاوە چەپکی گۆڵ بەقادرمە داروخاو و کۆنەکەدا بۆ شۆێنژینەکەی نەنکی سەرکەوت.

دایك وباوکی چەند پلەیەکی خوارو وەستابوون تاگفتوگۆی سەرتای بابوشکە و ئەلکسەندەرا تەنیا بێ.

ئەلکسەندەرا لەترسی نینۆکە دریژەکانی بەپشتی پەنجەکانی لەدەرگای شوینژینەکەی نەنکی دا.

پێش ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە بەدەنگێکی کز و بێزاریەوە ووتی:

- کێە لەم ساتەدا لەدەرگا دەدات ؟

بەدەم ووردە بۆڵەوە دەرگاکەی کردوە .

دیمەنی جوانی ئەلکسەندەرا ڕایچڵەکان.

جوانی چاوەکانی کرد بە چەپکە ووشەیەکی خۆشەویسیتی بێ دەنگ تێکەڵاوی چەپکە گوڵکەی دەستی کرد.

چونکە ڕەنگی ڕۆحی چاوەکانی بابوشکە و ئەلکسەندەرا لێکچونێکی تێدابوو . هەردووکیان ڕوانیانە ئاوینەی چاوەکانی یەکتری و هەردووکیان ووتیان چاومان یەك ڕەنگی ڕۆحی هەیە.

بابوشکە بەبینی چاوی کوڕەزاکەی ئارام بوو . وەك ئاشنای رۆحی بێ بێدەنگ بوو. ئەلکسەندەرا لێنزیك بووە چەپکە گوڵەکەی دایە دەستی وباوشی پێداکرد.

نەك رەنگی چاوەکانیان لەیەك دەچوو . بۆنی رۆحیان زوو ئاشنای یەکتری بوون , هەردووکیان باوەشیان بەگەرمیەوە بەیکداکرد.

- تۆ بابوشکەی منی و منیش کوڕەزای تۆم . ئەلکسەندەرا ووتی
- کچم من کوڕەزام نیە . لێ رەنگی چاوەکانت زۆر ئاشنان.

ئاوڕێکی لەئاوینەکەی تەنیشتی دایەوە دەستێکی بەبرۆکانی و پشت چاویدا هانی تارەنگی چاوەکانی جوانتر ببینێ . سەیرێکی چاوەکانی خۆیکرد ولەتەك چاوەکانی ئەلکسەندەرادا بەراوردی کرد.

لەو کاتەدا سلۆڤیچ و ئەننا چوونە ژوورەوە .

سلۆڤیچ بەدەم پێکەنینەوە باوەشێکی بەختیاری وشانازی بەدایکیدا کرد ووتی :

- دایە من دڵنیان خوا هەیە

ئاماژەی بە ئەلکسەندەرا کرد

- ئەم شۆخە . کچی من و کورزای تۆیە
- ئەم شۆخە خانمەش ئەننای هاوسەرمە
- ئیتر گلەی مەکە تۆ بویتە بابوشکە .منیش بە باوك وخاوەن خێزان

بابوشکە حەپەسابوو ..سەێرێکی سلۆفیچی کرد

ئەمە راستە یان شانۆ گەری ؟

ئەننا و ئەلکسەندەرا یەکی دەستێکی بابوشکەیان گرت و ووتیان

بابوشکە ڕاستە شانۆگەری نیە.

وەك لە خۆشیدا توانای وەستانی نەبێت لەسەر کورسیەك دانیشت وچاوەکانی تەڕبوون . بۆ دڵنیایی ڕوانیە چاوەکانی ئەلکسەندەرا .

ووتی:

ئەم ڕەنگی چاوانە ڕەنگی چاوی منە ترازاونەتە چاوی کچەکەتەوە بۆیە دڵنیام تۆ ڕاستدەکەیت :

- کورڕم دەکرێ ئەم چیرۆکەم بۆ بگێریتەوە ؟

سلۆڤیچ ئەننا و ئەلکسەندەرای لەژێر باڵەکانیدابوو .

سەری هەردوکیانی ماچکرد ووتی :

- دایەگیان لەم پرسیارە گەڕی زۆر خەجاڵەتم نامەویت میژوویی شەرمەزاریم بۆ هیچ کەس بێخۆینمەوە .

***2011-10-07* سان پیترسبۆرگ**

**کاتژمێر *2.47* بەیانی .**

**زیاد ڕەوی نیە لە دوا ڕستەی نووسینی ئەم ڕۆماندا خۆشم گریام**